

شەهید مەلا ئاوارە

# دیوانی مەلائاوارە

کۆکردنەوەی

## عەولا مینایی

PDF 4 KURD

## ناوەرۆک





## پێشەکی

دەزانم کە کارێکی زۆر ئەستەم و گرانم دەس داوەتێ، بە قەولی پێشینان لە کێوی هۆملی ڕاچووم، دەمەوێ کتێب بنووسم و ناشوێرم بچمە لای خوێندەوار و زانا و شارەزاکان سڵاو بکەم و ئەحواڵیان بپرسم و پێیان بڵێم: بەڕێزان! زانایان! بەنیازم کتێبێک بە زمانی کوردی بنووسم و بڵاوی بکەمەوە. دیارە ئەوانیش لێم دەپرسن دەڵێن کتێبەکە لەبارەی چ مەسەلەیەکدایە؟ منیش دەڵێم چۆن، ئاخر بەتەمام لەبابەت شەهیدی نەمر **مەلائاوارە** کتێب بنووسم. ئاشکرایە کە بۆ ئەو کارە بەکەڵکە دڵ گەرمم دەکەن، بەڵام دەشترسم کە بڵێن نەکەی نیازی وات هەبێ و نابێ خۆت بەو کارە سەختەوە خەریک کەی، چونکە ئەو کارە لە توانای تۆدا نییە و خوێندەواریت بەو ڕادەیە نەگەیشتووە کە تۆ بتوانی لەبارەی ژیان و بەسەرهات و تێکۆشان و شەهید کرانی **ئاوارەی** کوردپەروەرەوە کتێب بنووسی. لێم ڕوونە کە بە خزمەتیان بگەیشتمایە و وایان بگوتایە

PDF 4 KURD

قسەکەیان زۆر ڕاست و بەجێ دەبوو، چونکە نووسین لەبارەی **ئاوارە**، خەریک بوون و زانیارییەکی تەواوی دەوێ.

لەو بیر و بۆچوونەدا بووم شتێکی ڕابوردووم کەوتەوە یاد کە لە حەوتەنامە و ڕۆژنامە سیاسییەکاندا خوێندبوومەوە کە نزیکەی شێست ساڵ لەمەو پێش میرزا کووچک خانی جەنگەڵی کە بۆ ئازادی ئێران لە دژی زۆرداران ڕاپەڕیبوو، ئەو مەرامنامەی خۆی تەنیا لە سێ وشەدا نووسیبوو بەم شێوە:

*١ـ چوونە دەرەوەی هێزەکانی بێگانە*

*٢ـ جێگیر بوونی ئاسایش و لەناو چوونی بێدادگەری*

*٣ـ ڕاپەڕین دژی تەکڕەوی و ئیستبداد*

لەوانەیە زۆر لە خوێندەواران هەرکە ئەم پێشەکییەیان خوێندەوە بڵێن هەمزە لە هەباسی چی و گەزی چی و جاوی چی، بار لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە، چی بە سەر چییەوەیە و لە مەبەست لای داوە.

ئەی خوێندەوارینە! ئەی بەڕێزینە! وا بیر مەکەنەوە.



ئاخۆ دەزانن من لەم نموونە هێنانەوەدا چ شتێکم مەبەست بووە؟ دیارە کە ئێوەی خۆشەویست کەمێک بیر دەکەنەوە و زۆر بە باشی دەزانن کە نیازی من لەم نموونە هێنانەوە ئەوەیە کە وەختی خۆی میرزا کووچکخان تەنیا لە سێ وشەدا مەرامنامەی خۆی دیاری کردبوو، بەڵام دوابەدوای ئەو، مەرامی گەلانی ئێران زیاتر تەقییەوە و دەنگی دایەوە و ڕوونتر کرایەوە، وەک بە زاری هەموو کەسەوە دەگوترێ و دەڵێن: ئازادی، یەکیەتی و عەدالەت و سەربەستی و دەیان و سەدان و هەزاران وشەی دیکە و مەرامی ئێستا زۆر لە سێ وشە زیاترە. من خۆم نابەمە ڕیزی قارەمانێکی وەک میرزا کووچکخانی جەنگەڵی و مەرامیش نانووسم، بەڵام هەر نموونەی بەو مەرامە ڕەوایە دێنمەوە و بەو هیوایە لە نووسینی ئەم کتێبە ڕاچووم کە پێم وایە من هەر دەتوانم هەر ئەوەندەی یەک یا دوو باس لەبارەی ژیانی **ئاوارە** بنووسم و هیوادارم کە بە دوای دەرچوونی ئەم کتێبەدا نووسەرانی کورد هەرچی لە بابەت **ئاوارە** دەزانن و قازانجی گشتی تێدا بێت

PDF 4 KURD

کەمتەرخەمی نەکەن، بنووسن و وشەکان زیاد بکەن. دەیان، سەدان، هەزاران وشە بنووسن، با هەموو کەس لە هەموو جێگایەک **ئاوارەی** شەهید بناسێ و بزانن ئاخۆ **مەلائاوارە** کە هێندەی باس دەکەن و لەپاش چەند ساڵ شەهید بوونیش و چوونە ناو گڵەوە بۆچ هەر ناوی دێنن و لەشی کە لە ژێر گڵدایە ناوی بۆ لە یادی کەس نەچۆتەوە و هەر باسی دەکەن و لە سەری دەدوێن؟ چ کەسێک بووە؟ لە چ نەتەوەیەک بووە؟ لە کوێ و لە چ بنەماڵەیەک بووە و چ وەختێک و لە چ شوێنێک هاتۆتە دونیاوە؟ ئایا خوێندەوار بووە؟ لە کوێی خوێندووە؟ چەن ساڵ ژیاوە؟ ژیانەکەی چۆن بووە؟ لە کوێ ژیاوە و مەرامی چ شتێکی داوا دەکرد و لەبەر چی و بە دەستی کێ شەهید کرا و لە کوێ نێژرا؟ بەڵکوو ژیان و بەسەرهات و خەباتی **ئاوارە** ببێتە دەرسێک بۆ ڕاپەڕین، تێکۆشان، ئازادی و خۆڕاگرتن لە بەرامبەر برسییەتی و هەژاری و بەشخوراویدا. با ببێتە دەرسێک بۆ گیانبەخت کردن لە پێناوی ئازادی و مافە زەوتکراوەکانی گەلی کورد. با ئەو ڕێگایەی **ئاوارە**



پێیدا دەڕۆیشت، ئێمەش بەری نەدەین، چونکە ڕێگای **ئاوارە** ڕێگای ئازاد بوونی تەواوی گەلانی ئازادیخوازی دونیا بوو، با هەموو گەلانی دونیا بزانن کە خەباتی ئێران و جیهان بۆ ئازاد بوونە لە دەس ئیمپریالیزم و نۆکەرانی.

وا من، منی کەمسەواد، پێنووسەکەم خستە ناو پەنجەکانی دەستم، بە ئومێدی خوداوەندی گەورە نووکی پێنووسەکەم بردە سەر کاغەز و لەبارەی شەهید **ئاوارە** دەستم کرد بە نووسین و ئەوەی لە توانا و بیرمدا بێت دەینووسم و لەوانەیە چەن لاپەڕەی سپیی کاغەزەکە ڕەش بکەمەوە و هیوادارم کە ئەم نووسینە کورتەی من سەرەتایەک بێت بۆ لێکۆڵینەوە و نووسین و زۆرتر ناساندنی **ئاوارەی** شەهید بە گەلانی کورد و جیهان لە لایەن نووسەرە دڵسۆزەکانی گەلی کورد.

ع. م. ئالانی

خاکەلێوەی ١٣٥٨ی هەتاوی

PDF 4 KURD

## مەلائاوارە کێ بوو؟

منداڵ کە لە دایکی جوێ دەبێتەوە و دێتە سەر دونیا، لە دوای حەوت شەو و ڕۆژ ناوی لێ دەنێن. لە ماوەی ئەو حەوت ڕۆژانەدا باب و دایکی منداڵەکە بیر دەکەنەوە کە چ ناوێکی باش لە ڕۆڵەکەیان بنێن. ئەگەر کوڕ بێ، ئەوا دەبێ نێوی پیاوانەی لێ بنێن؛ ئەگەر کچیش بێ نێوی ژنانە. منداڵی بەستەزمان هیچ بیروڕایەکی لەبابەت هەڵبژاردنی نێوی خۆی پێ نادرێ، جا هەرکە گەورە بوو، ناوەکەی پێ خۆش بێ یا ناخۆش، دەبێ هەر ڕازی بێت. دەڵێن سەمەدی بێهڕەنگی نێوی برازاکانی خۆی بۆخۆی هەڵدەبژارد و نێوی لێ دەنان. جارێکی برایەکی خەریک بوو نێوی کوڕەکەی بنێ فەرهاد، بەڵام سەمەد ڕازی نەبوو؛ گوتی: کاکە، ناوی فەرهاد بۆ ئیمرۆ نابێ، چونکە فەرهاد ئینسانێکی عاشق بووە، ئەمڕۆ پێویستمان بە ناوی قارەمانان و شۆڕشگێڕان هەیە، وەکوو کاوەی ئاسنگەر.



جا بەو بۆنەوە کوڕی برایەکەی ناو نا "کاوە".

**مەلائاوارە** لە ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی لە ئاوایی شەڵماشی ناوچەی سەردەشت لە بنەماڵەیەکی ئایینی هەژار و چەوساوە هاتە سەر دونیا. ئەویش وەکوو هەموو منداڵانی دیکەی سەر زەوی دوای حەوتەیەک ناوی لێ نرا. باوکی **ئاوارە** کە مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی هەمەوەندی شەڵماشییە، پاش حەوت ڕۆژ بەراورد و بیر کردنەوە و موتاڵا کە لە تەئریخ و کتێباندا خوێندبوویەوە کە کورد قارەمانێکی وەکوو فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و هەروەها شاعیرێکی نیشتمانپەروەری وەکوو ئەحمەد موختاربەگی جاف و شاعیری گەورەی کوردی ئەحمەدی خانی و دەیان ناو ئەحمەدی قارەمانی دیکەی لێ هەڵکەوتووە، ئەویش ناوی کوڕی خۆی نا "**ئەحمەد**".

**ئەحمەد** کە گەورە بوو لە تەمەنی منداڵیدا لە لای باوکی قورئانی مەجید و کتێبی ناگەهان و ئیسماعیلنامە و چەند کتێبێکی دیکەی خوێند، بوو بە فەقێی باوکی و

ئەو دەرسی ئایینی پێ دەگوت، چونکە مەلا محەمەدئەمین لە دێی شەڵماش فەقێی هەبوون و تەدریسی دینی دەکرد.

فەقێ ئەحمەد بۆ خوێندن چووە گوندی "ئاوایی" لە لای مامۆستا مەلا ساڵحی بێژوێ (ئیسلامئاوا) دەرسی ئایینی خۆی پەرە پێدا و لە سوختەیی دەرچوو، بوو بە موستەعید. ئەمجا پێیان دەگوت **مەلائەحمەد**. لە چەند حوجرەی دیکە دەرسی ئاینی خوێند و پلەی خوێندنی بەرەو ژوور چوو. تەمەن گەورە بوو و خۆی دا لە بیست ساڵ. زۆر باوەڕی بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەبوو.

**مەلائەحمەد** هەمیشە موتالەعەی دەکرد، کتێبی دەخوێندەوە، بیری دەکردەوە، دەیڕوانی، دەیبیست، لە تەئریخ و بەسەرهاتی جیهاندا دەیخوێندەوە کە زۆربەی گەلانی ئەم جیهانە ئازادن، سەربەستن، بۆخۆیان سەربەخۆن، یان خودموختارییان وەرگرتووە و لە وڵاتی خۆیاندا سەربەخۆ دەژین. بیری دەکردەوە و دەیگوت دونیا پێنج قاڕەیە، نیزیکەی سێ هەزار ملوێنی بنیادەم



تێدا دەژی، ئەو گەلانە بوونە نیزیکەی سەد و چل دەوڵەت، هەر چەندە چین ئەو وەختە حەوسەد ملوێن کەس بوو، بەڵام کیشوەری واش هەبوو لە دەیان هەزار کەس زیاتر ئینسانی لێ نەبوون.

بەو جۆرە **مەلائەحمەد** دەیزانی کە کورد هەژدە ملیۆن کەسە و لە نێوان چوار دەوڵەتاندا نیشتمانەکەی دابەش کراوە و نەک هەر نەیانهێشتووە سەربەست بژی، بەڵکوو لە تەواوی مافە ئینسانییەکانیش بێبەش کراوە. ستەمی نەتەوایەتی باڵی کێشاوە بە سەریا و دەیبیست کە کوردیش زۆر جاران ڕاپەڕیوە و خەباتی کردووە و داوای خودموختاری کردووە، بەڵام وەڵامی دوژمنانی کورد هەر گرتن و کوشتن و لێدان بووە و بەس. ئەو حەقەی کورد شەڕی بۆ کردووە و تێیدا ماڵوێران بووە نەیدراوەتێ. سەرەڕای بێبەشیش هەمیشە لە لایەن خوێنمژان و ئیمپرالیزمەوە چەوسێنراوەتەوە و دەیان جۆر زوڵم و ستەمی لێکراوە.

**مەلائەحمەد** دەیدی کە لە بەرچاوی وی ژاندارم و

PDF 4 KURD

پۆلیسەکانی ڕژیمی خوێنخۆری حەمەڕەزاشا خەڵکی بێچارەی کورد دەگرن و دەکوژن و دەیکرووسنەوە و بە هەموو جۆر زوڵمی لێ دەکەن. بیری دەکردەوە و دەیکوت خۆ کوردیش ئینسانە و حەقی ژیانی هەیە. کورد زمانی زگماکی جیاوازی هەیە، کورد وڵاتی تایبەتی خۆی هەیە کە لەوەتا ئینسان لەسەر ئەرزە، تێیدا دەژی کە پێی دەڵێن ***کوردستان***، خوو و ڕەوشت و جل‌وبەرگ و ئادابی جیاوازی هەیە و نەتەوەی کورد یەکێکە لە نەتەوە هەرە کۆن و پێشکەوتوو و بەناوبانگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. کەواتە بەو هەموو بەڵگە و دەلیلە ڕاستەوە بە ئیسپات گەیوە کورد نەتەوەیە و حەقی ژیان و سەربەخۆیی تەواوی لە سەر پشتی ئەم دونیایەدا هەیە کە لە ژێر ئاسمان و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەکاندا ڕاوەستاوە.

دیسان **مەلائەحمەد** بیری دەکردەوە و دەیگوت زۆرم پێ سەیرە ئەو میللەتانەی کە بوونە دەوڵەت یان سەربەخۆیی‌یان وەرگرتووە و بە ئاسایش لە



نیشتمانەکەیاندا سەربەست دەژین، خۆ ئەوانیش هەروەکوو کوردەکان خوا لە تۆزە خاکێک دروستی کردوون دەنا هەموو شکڵ و شێوەیەکیان وەکوو یەک وایە و هەموویان هەر بە زمانی خۆیان دەدوێن و بە گوێ، گوێ لە قسە و باس ڕادەگرن و بە عەقڵ بیر دەکەنەوە و بە دەس کار دەکەن و بە پێ دەڕۆن بە ڕێگادا. هەموان خواردن و خەویان هەیە و هەمووشیان هەر دەمرن و هەموویان هەر لە هەوای ئازادی ئەم دونیا پان و بەرینەدا نەفەس هەڵدەمژن، تەنیا هەر لە ڕەنگدا چوار جۆرن: ڕەش، سپی، زەرد، سوور؛ بەڵام لە بەشی ژیان و سەربەستیدا هەروەکوو یەکن، کەچی سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگە و دەلیلانە فەرق و جیاوازی لە میللەتی کورد کراوە و لە چکۆلەترین مافی ئینسانی بێبەش کراوە.

**مەلائەحمەد** ئەم هەموو زوڵم و زۆرییەی دەدی، زوڵمی ڕابردووشی لە تەئریخەکاندا دەخوێندەوە، دەشی‌زانی کێ ئەو زوڵمە لە میللەتی کورد دەکا. بەڵێ

PDF 4 KURD

دەیزانی کە داگیرکەرانی کوردستان و شای زاڵم و نۆکەرانی ئیمپریالیزم ئەو غەدرە دەکەن و کورد بە هەموو جۆر دەچەوسێننەوە و نایەڵن بە مافی قانوونی خۆی بگات و هەر جارەش کە داوای حقووقی خۆی کردبێ سەرکوتیان کردووە.

**مەلائەحمەد** دەیگوت من ئینسانێکی کوردم، ئینسانێکی موسوڵمانم. ئیسلام هیچ کات سەری بۆ زوڵم و زۆر کەچ نەکردووە و بە شمشێر خەباتی کردووە. ئەو هەموو زوڵمەی لە کورد دەکرێ لە منیشە، با منیش وەک گەلانی ئازادیخوازی دونیا ڕاپەڕم، تێکۆشم، گیانی خۆم لە پێناوی ئەو ئینسانە زوڵم لێکراوانەدا بەخت کەم. ڕقی هەڵدەستا و خەریک دەبوو گۆپاڵێکی وەک هی کاوەی ئاسنگەر هەڵبگرێ و بچێ بیدا بە تەوقی سەری شا و ئیمپریالیزمدا و بۆ هەتا هەتایە لە ناوی بەرێ، بەڵام دەهاتەوە سەرخۆ و بیری دەکردەوە و دەیکوت نا، ئەو کارە زۆر ئاسان نییە و لە توانای تاقە ئینسانێکدا نییە، چەپڵە بە دەستێک لێ نادرێ، تاقە سوار



چی پێ ناکرێ، پێویستە هەموومان یەک بگرین، هەموو ئینسانە زوڵم لێکراوەکان یەک گرن، یەکدەنگ و یەکڕەنگ شان وەبەر دەن، دەست بخەنە ناو دەستی یەک. هەموو بە تێکڕا بو ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتە خۆشەویستەکەمان تێبکۆشین، لە دژی زۆرداران ڕاپەڕین، شۆڕش بکەین، گیانی خۆمان بەخت کەین تا ئینسانەکانی کوردیش وەک هەموو ئینسانەکانی سەرڕووی زەوی سەربەست بژین. **مەلائەحمەد** لە تەمەنی گەنجیەتیدا ئەم هەموو شتانەی وەک فیلمی سینەما بە بەرچاویدا دەهات و هەستی بە تەواوی کەم و کورتی و گیر و گرفتەکانی ئەم گەلە هەزارە دەکرد.

**با بزانین مەلائەحمەد چی کرد؟** هەستا بە دڵێکی وەک پۆڵا سوێندی خوارد بە ئایین و نیشتمان، سوێندی خوارد بە مافی زەوت‌کراوی کورد، سوێندی خوارد بە شەهیدانی کوردستان کە ڕاپەڕێ، بڕوا بەرەو پێش، بە دڵ و گیان، تا دوا هەناسەی ژیانی نەگەڕێتەوە دواوە و تێبکۆشێ بە بێ ماندوو بوون، بێوچان بۆ خزمەتی

PDF4KURD

ڕوونـاکبیران و عەشـیرەتە نیشـتمانپەروەرەکانـە. جووڵانەوەی هەموو چین و توێژ و هەموو ئینسانێکی بەش خوراوی کوردە و تێیدەگەیاندن کە جووڵانەوەی کورد هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ جووڵانەوەی ئازادیخوازی تەواوی گەلانی ئێران و جیهان. تێیدەگەیاندن کە دەبێ بە تێکڕا خەبات بکەین دژی داگیرکەر و ئیمپریالیزم تا بە مافی خۆمان دەگەین.

**مەلائاوارە** دەگەڵ بەرنامەی تەبلیغاتی هەڵبەستی سادەی بە زمانی کوردی دەنووسی و بۆی دەخوێندنەوە و خەڵکی ناوچەکانی کوردستانیش هەڵبەستەکەیان لێ وەردەگرت. لە بەریان دەنووسییەوە و خوێندەوارەکان، بۆ نەخوێندەوارەکانیان دەخوێندەوە. هەر لەو کاتەدا کە **مەلائاوارە** لە کوردستانی ئێران زۆر بە نهێنی لە دەورانی دارودەستەی بنەماڵەی خوێنخۆری پەهلەوی خەباتی خۆی لە ناو کۆمەلانی گەلی کورددا پەرە پێدەدا، لە کوردستانی عێراق شۆرشی خەڵکی ستەملێکراوی



خەڵکی بەش خوراوی کورد لە دژی زاڵمان ڕاپەڕێ و یەخەیان بگرێ و بیانهێنێتە پای مەحکەمە و مافی زەوت کراوی کوردیان لە دەس دەرهێنێتەوە.

**مەلائەحمەد** بەو نیازە پاکەوە لە سەر قسە و پەیمانی خۆی سوور بوو و ڕاپەڕی. ڕێگای ڕاستی میللەتی کوردی گرتە پێش. دەستی کرد بە جووڵانەوەی سیاسی لە کوردستانی ئێراندا بە نهێنی و هەر بەو بۆنەشەوە ناوێکی زۆر جوانی دیکەشی بۆ خۆی هەڵبژارد و ناوی لە خۆی نا "**ئاوارە**". ئەمجا پێیان دەگوت **مەلائاوارە**، بوو بە ئەندامی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، چووە ناو جووتیارانی لادێ، بوو بە هاوڕێیان، بوو بە دۆستی ڕاست و بێوێنەیان، قسەی بۆ دەکردن، تێیدەگەیاندن. لەبارەی جووڵانەوەی کورد ڕوونی دەکردنەوە، چۆنیەتی جووڵانەوەی کوردی دەبردە مێشکیانەوە کە جووڵانەوەی کورد جووڵانەوەیەکی چینایەتی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و سیاسییە. جووڵانەوەی جووتیاران و کرێکاران و

PDF 4 KURD

کورد بە ڕابەرایەتی پارتی دێموکراتی کوردستان لە دژی حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم کە مافی کوردی زەوت کردبوو هەڵگیرسابوو. لەو وەختەدا **مەلائاوارە** بیروڕایەکی ڕووناکبیرانەی دیکەی کەوتە سەر و بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی شەڕە پارتیزانییەکانی کوردستانی عێراق کەڵک وەرگرێ و بە تەواوی فێری شەڕی پارتیزانی بێت و ئەمجا بە کۆڵێک زانیاری و جەنگاوەرییەوە بگەڕێتەوە کوردستانی ئێران تا زیاتر بتوانێ خزمەت بە خەڵکی کورد بکا، بەو نیازە ڕووی کردە کوردستانی عێراق و لە ناوچەی سلێمانییە چووە ناو ڕیزی شۆڕش و بوو بە پێشمەرگە و چەکی شۆڕشگێڕی کردە شانی و وێڕای هەموو پێشمەرگەکانی کوردستانی عێراق چووە ناو سەنگەر و بەرامبەر هێزی داگیرکەری ستەمگەر دەجەنگا و نەدەسڵەمییەوە، هەرچەند لە کوردستانی ئەودیو بەرەڕووی دوژمنان دەجەنگا، پێی وا بوو کە لە کوردستانی ئێران دژی ڕژیمی بەکرێگیراوی شا بۆ



مافی کورد شەڕ دەکا. **ئاوارە** فەرق و جیاوازی نەدەکرد، ئەو بۆ کورد، بۆ مرۆڤ، بۆ تەواوی ئینسانە بەشخوراوەکان تێدەکۆشا، جا بۆ ئەو گرینگ نەبوو لە کوردستانی ئەودیو بێت یا لە ئێران. ئەو هەر پێی وا نەبوو کە هەر لە کوردستانی عێراق خەبات دەکا. بیر و باوەڕی **مەلائاوارە** بیر و باوەڕێکی شۆڕشگێڕانە بوو. پێی وا بوو لە سەنگەرەکانی ویتنامدا ویتکۆنگە و ڕووبەڕووی داگیرکەرانی ئەمریکایی دەجەنگێ. **مەلائاوارە** پێی وا بوو کە یەکێکە لە فیداییەکانی فەلەستینە و لە ناو خاکی ئەواندا لە دژی داگیرکەری سەهیۆنیست خەبات دەکا. بەڵێ **ئاوارە** پێی وا بوو لە ناو سەنگەرەکانی تەواوی گەلانی ئازادیخوازی دونیا بەرامبەر تەواوی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی ڕاوەستاوە و بەربەرەکانی دەکا. هەر لەناو سەنگەری کوردستانی عێراقیشدا شیعری دەنووسی و دەیدایە بەرا پێشمەرگەکانی و لە سەنگەرا بە شێوەی سروود دەیانخوێندەوە.

**ئاواره** هەموو پێشمەرگەکان دەیانناسی و ڕێزیان لێ دەگرت. پێشمەرگەکان حەقیان بوو کە **ئاواره**یان خۆش بوێ، چونکە **ئاواره** چووبووە ناو دڵی ئەوانیشەوە و لەبارەی چۆنیەتی خەبات زیاتر ڕوونی دەکردنەوە، بە کورتی بڵێین **ئاواره** دەگەڵ تەواوی ئازادیخوازەکانی دونیا هاوخەبات و هاوسەنگەر بوو.

**مەلائاواره** تا ئەو کاتە ببووە شاعیرێکی باش و لە نووسینی شیعری شۆڕشگێڕانەدا دەستێکی بەرزی هەبوو. **ئاواره** دوای ئەوەی سەنگەر بە سەنگەر وێڕای پێشمەرگەکان سەدان شەو و شەونخوونی کرد و دەگەڵ ئەوان ئاوی تاڵ و سوێری خواردەوە و فێری شەڕی پارتیزانی بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ (بەرامبەری ١٣٤٣ی هەتاوی) گەڕایەوە بۆ کوردستانی ئێران و لەگەڵ چەن کادری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەستی کردەوە بە تێکۆشانی سیاسی لەناو جووتیاران و زەحمەتکێشانی کورددا. ناوبراو لە ناوچەی سەردەشت لە ئالان و باسک کولە سێو و



سوێسنان جوولانەوەی خۆی دەس پێ کردەوە، بەڵام ئەمجارە لە جاری پێشوو توندوتیژتر هاتەوە مەیدانی بەربەرەکانی لە کوردستانی عێراق فێری شەڕی پارتیزانی ببوو. زۆری سەیری کتێبی سیاسی و ڕۆژنامەی کوردی و عەرەبی کردبوو. زیاتر لە هەواڵی جیهان حاڵی ببوو، زۆرتر تێدەگەیشت و زۆرتر لە جاران بیری دەکردەوە و هەر دەتگوت **مەلائاواره**ی دوێنێ نەماوە، گەلێک شت فێر ببوو، شاعیرێکی باشیش بوو، بیری شۆڕشگێڕانەی چاکتر گڕی گرتبوو، لە خوو و ڕەوشتدا **مەلائاواره** بێوێنە بوو، ڕاست و پاک و لەسەرخۆ و هێدی بوو. ئینسانێکی ڕۆحسووک و خوێنشیرین بوو. هەرگیز لە کەس تووڕە نەدەبوو، جنێوی نەدەدان، بوغز و غەرەزی دەگەڵ کەس نەبوو، خۆی بە زل نەدەزانی، هەموو بە جۆرێکی وەک یەک سەیر دەکرد. دەیگوت فەرقی هیچ ئینسانێک نییە و هەموویان هەر خودا دروستی کردوون. خواردن و خەویشی زۆر کەم بوو، پیاوێکی کەڵەگەت، نە زۆر

PDF 4 KURD

کز و نە زۆر قەڵەو بوو.

گوتمان **ئاوارە** دەستی کردەوە بە تێکۆشان، دێ بە دێ دەگەڕا و دەچووە ناو مەزرا و باخەکان. دەچووە ناو یەک یەکی جووتیاران، دەچوو بۆ لای پۆلە هەرەوەز و دروێنەوانەکان، دەچوو بۆ ناو تووتنەوانەکان، کاری لەگەڵ دەکردن، کاتی حەسانەوە و دانیشتن قسە و باسی بۆ دەکردن، لەبارەی ژیان و گوزەرانیان پرسیاری لێ دەکردن و لە خەم و پەژارە و ئێش و ئازاریاندا بەشدار دەبوو. جووتیارانی ڕوون دەکردەوە، بۆ ئەوەی ئامادەیان بکا بۆ ڕاپەڕینێکی جووتیاری لە کوردستاندا دژی داگیرکەران بۆ ئەستاندنی مافەکانیان.

**ئاوارە** لە زۆربەی دێیەکان ببوو بە هاوڕێ و هاوخەباتی جووتیارانی زەحمەتکێشی چەوساوە. **ئاوارە** وەکوو ئینسانێکی کورد، وەکوو شۆڕشگێڕێکی بەشەردۆست چووبووە ناو دڵ و دەروونی هەموو کۆمەڵانی ڕەنجدەری کوردستان، بۆ هەر دێیەک



دەچوو بەتێکڕا دەیانناسی، منداڵی وردیشیان دەیانناسی. کە لە دووری دێ دەردەکەوت دەیانگوت هات **مەلائاوارە** هات. بە هاتنی **ئاوارە** دڵخۆش دەبوون، **ئاوارە** زۆربەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی بۆ ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕانە و وریا کردنەوە و پەیوەندی پێکەوە گرێ دابوون.

**ئاوارە** بە تەواوی، هەستی بە ئێش و ئازاری خەڵکی زەحمەتکێشی کوردستان کردبوو، بەتایبەتی بە تووتنەوانەکان، چونکە تووتنکارەکان زۆر ماندوو دەبوون و ئارەقیان دەڕشت، هەر لە سەرەتای بەهارێڕا هەتا مانگی هەوەڵی پاییزێ حەوت مانگی تەواو چنگ و نینۆکیان پێوە نەدەمان و ئارەقیان دەڕشت و نیوە عەمر دەبوون، هەتا چەن فەردەیەکیان تووتن دەهێنایە بەرهەم و دەیانبردە بەردەستی مەئموورە بێڕوحم و بێئینسافەکانی ئەوکاتەی ئینحیساری دوخانیاتی دەوڵەتی داگیرکەری شای خائین. ئەوانیش بە کەیفی خۆیان، خۆیان دەخستە سەرپشت، هەر بە قەلانگی و بە

PDF 4 KURD

نرخێکی زۆر کەم لێیان دەکڕین. بەڕاستی بڵێین هەر لێیان دەستاندن. ئەو تووتنەوانەی خوا نەکردە چەند کیلۆی تووتن لەو میزانەی کە هەوەڵی بەهارێ مەئمووری تووتن‌نووسەکان نووسیبوویان کەمتر بوایە، واوەیلا بە حاڵی. دوخانیە دەینارده دادگا و سزایەکی زۆریان لێ دەستاند.

**مەلائاوارە** کە ئەو زوڵم و زۆرەشی وەبەر چاو دەکەوت بە جارێک دڵی بۆو تووتنەوانە هەژارانە دەسووتا و دەستی دەبرد بۆ پێنووسەکەی و لەبارەی ئەو زوڵمە بێوێنانە دەستی بە نووسین دەکرد. هەڵبەستی (*هاواری تووتنەوانێکی ناوچەی سەردەشت*) یەکێک لەو شێعرانەیە کە بە زمانێکی سادەیە و هەموو کەس تێی دەگا. لەو کاتەوە تا ئێستا کە پازدە ساڵی[1] تەواو لە نووسینی ئەو هەڵبەستە ڕادەبرێ، تام‌وچێژی خۆی لە دەست نەداوە و زۆربەی خوێندەوارەکانی کورد هەر

[1] دیارە ئەم باسە هی ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوییە.



لەبەر دەیخوێننەوە.

**مەلائاوارە** شێعرێکی دیکەی نووسیوە بە ناوی (*ڕەش‌بگیری*) کە بەسەرهاتی باس‌کراو لە شێعرەکەدا لە ئاوایی بێژوێ (ئیسلام‌ئاوا) ڕووی داوە. لەو شێعرەدا زوڵم و زۆری ژاندەرمەکانی سەردەمی حەمەڕەزاشای خوێنمژ و هەروەها قارەمانیەتی ئافرەتی کوردی بە تەواوی بۆ ڕوون کردووینەوە.

**ئاوارە** زۆر حەزی لە کێو و شاخ و کانیاو و مەزرا و دەشت و شینایی دەکرد. دێ بە دێ شارەزای هەموو جێیەک بوو. هەموو خەڵکی ناوچەکەی دەناسی. بە تێکڕا هەموو وڵاتەکەی هەر خۆش دەویست. حەزی دەکرد قەت لێی دوور نەبێتەوە. جا بەو هەست و دەروونە خاوێنەیەوە پارچە شێعرێکی زۆر جوان و ڕێکوپێکی نووسیوە بە ناوی (*بخوێنەوە و ئاڵان بناسە*).

**مەلائاوارە** چەن پارچە شێعرێکی دیکەشی لەپاش بەجێ‌ماوە بە ناوی (*لایی‌لایی*) و (*هەدا نادەم ڕۆژ و شەوێ*) و هەروەها پارچە هەڵبەستی (*ئێمە کە بە ناو

*کۆمەڵی پێشمەرگەی خاکین*). **مەلائاوارە** شیعری دیکەشی بووە بەڵام بە داخەوە لە ناو چوون. جا بۆ ئەوەی زۆر لە ناوەرۆکی باسەکەمان دوور نەکەوینەوە وا باشە ئەو شیعرانەی باسیان کرا لێرەدا نەنووسرێ، بەڵکوو لە کوتایی ئەم بەسەرهاتەدا لە بەشی ئاخری کتێبەکە پارچە هەڵبەستەکان دەخەینە بەرچاوتان.

**ئاوارە** بە گیان و دڵ تێکۆشانی سیاسی خۆی درێژە پێدا و بە خۆی و گۆچانەکەی دەستیەوە دێ بە دێ و مووچە بە مووچە هۆبە و هەوارەکانی کوردستان دەگەڕا و تەبلیغاتی سیاسی دەکرد. کوردایەتی ڕاستەقینەی دەبردە مێشکی هەموو ئینسانێکی چەوساوەی کوردەوە. هەر لەو کاتەدا مەئموورە کاسەلێسەکانی حکوومەتی فاشیستی ئەووەختەی ئێران شەو و ڕۆژ لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە **ئاوارە** بخەنە تەڵەوە و بیگرن و لە ناوی بەرن. بەڵام زیرەکی و وریایی و لێزانی **ئاوارە** وای سەر لە ڕژیمی چەپەڵی شا شێواندبوو کە ئەو هەموو کاربەدەستە ورگزلانە نەک



نەیانتوانی **ئاوارە** بگرن، بەڵکوو هەر بە شوێن و جێگەکەشیان نەدەزانی و بە تەواوی هێز و توانایانەوە خەریک بوون، بەڵام هەموو جارێ ڕیسەکەیان لێ دەبۆوە بە خوری.

**ئاوارە** بۆ هەر جێگایەکی چووبایە ساکێکی پڕی کتێب و نووسراوە و بەیاننامە و بڵاوکراوی کوردی پێ بوون و لەگەڵ خەڵک کۆ دەبوونەوە، پاش قسە و باس و بیروڕا دەربڕین دەستی دەدا کتێب و بۆی دەخوێندنەوە، دەیگوت: ئەم کتێبە کوردییە و بە زمانەکەی خۆمان نووسراوە. بەیاننامەکانیشی پەڕ بە پەڕ بۆ دەخوێندنەوە و لە هەموو خەبەر و باسێکی ئەو دونیا پان و بەرینە ئاگاداری دەکردن. بۆی باس دەکردن کە دەوڵەتی داگیرکەری پەهلەوی زمانە شیرینەکەی لێ قەدەغە کردووین و نایەڵێ لە مەدرەسەکاندا بیخوێنن. دەبێ بۆ ناساندنی زمانی زگماکی خۆمان کە کوردییە خەبات بکەین. خەبات بۆ نووسین و خوێندنی کوردی یەکێکە لە ئاوات و ئارەزووەکانی دێرینەی

PDF 4 KURD

نەتەوەکەمان. دەبێ خوێندن بە زمانی کوردی ببێتە ڕەسمی.

**مەلائاوارە** دیسان لە ساڵی **١٣٤٥**ی هەتاوی ئاوارە بۆوە و چۆوە بۆ کوردستانی عێراق. لەوێ دەگەڵ تێکۆشەران و شۆڕشگێڕانی کوردستانی ئێران سولەیمان موعینی، سمایل شەریفزادە و عەولای موعینی بە یەکەوە بوون و ڕۆژنامەیەکی کوردییان دەنووسی بە ناوی (ئۆرگانی ڕۆژ) کە لە بارەی مەسەلەی کورد و گەلانی ئێران بۆ ڕزگار بوون لە دەس ڕژیمی شای بۆگەن و هەروەها هەواڵی کوردستانی ئێرانی تێدا دەنووسرا. لە ژمارەی سێی (ڕۆژ)دا بەسەرهات و چۆنیەتی شەهید بوونی شەهیدان "نەحۆ"، "کاک باپیر شکاک" و "مەلا سمایل" و سێ شەهیدی دیکەی بڵاو کرابۆوە.

لە ناوەڕاستی هاوینی ساڵی **١٣٤٥**ی هەتاوی سمایلی شەریفزادە، **مەلائاوارە**، سولەیمانی موعینی و عەولا موعینی و گەلێک لە تێکۆشەرەکانی کوردستانی ئێران



لە عێراقڕا گەڕانەوە بۆ کوردستانی ئێران و دەستیان کرد بە جووڵانەوەی سیاسی و بە شێوەی نهێنی و بە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا گەڕان. **مەلائاوارە** و هاواڵەکانی بۆ ئازادی سەرتاسەری ئێران و خودموختاری کوردستان لە چوارچێوەی ئێراندا خەباتیان دەکرد. دوای شەش مانگ گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق و هەر کە گەیشتنەوە وێ، کاربەدەستە خۆفرۆشەکانی ئەو وەختەی کوردستانی عێراق کە ڕاستەوخۆ نۆکەری ئەمریکا و شای بەکرێگیراو بوون دەستیان بە کوشتن و ئازار دانی کوردە تێکۆشەرەکانی کوردستانی ئێران کرد. چەن کەسیان کوشتن و گرتن و تەسلیم بە دەوڵەتی شایان کردنەوە.

کوردە دەربەدەرەکانی ئێران لە کوردستانی عێراق وەک ئاڵەتیان لێ هاتبوو، بارزانییەکان لێیان دەسووڕانەوە و هەر کەسێکیان وەچنگ بکەوتایە تەسلیم بە دەوڵەتی ئێرانیان دەکردەوە، تێکۆشەرانی

PDF 4 KURD

کوردستانی ئێران (کومیتەی ئینقلابی)یان پێکهێنا، کە ئەندامەکانی کومیتە، سولەیمان موعینی و **مەلائاوارە** و سمایلی شەریفزادە و عەولا موعینی بوون. دوای پێکهێنانی کومیتەی ئینقلابی گەڕانەوە بۆ ناو خاکی کوردستانی ئێران.

لە بەهاری **١٣٤٦**ی هەتاویدا دەستیان کردەوە بە خەباتی سیاسی و هەروەها چەکداریش. ئەو تێکۆشەرانەی کە هاوخەباتی **ئاوارە** بوون بۆ تێکۆشانی ڕاستەقینەیان چوونە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان. **ئاوارە** هاتەوە ئەو ناوچانەی کە لە پێشدا ناومان بردن. دیسان وەک جاری جاران بە لادێکاندا دەگەڕا و تەواوی نیشتمانپەروەرەکانی ئەو ناوچانەی بەسەر کردەوە و پێی ڕاگەیاندن کە ئێمە ئەم جارە دەمانەوێ تێکۆشانی سیاسی باشتر پەرە پێ بدەین و شورشی چەکدارانەش هەڵگیرسێنین، چونکە سیاسەت لە لوولەی تفەنگەوە هەڵقولاوە و سیاسەتی کومیتەی ئینقلابی وایە، دەبێ لوولەی تفەنگی دەگەڵ بێ. بەو بۆنەوە داوای لە



خەڵک دەکرد کە یارمەتییان بدەن، چەک هەڵبگرن، پیاوە ئازاکان بنێرنە شۆڕشەوە با لە دژی دەوڵەتی حەمەڕەزاشا ڕاپەڕین، نەک هەر لە کوردستان بەڵکوو دەبێ بە پشتیوانی و هاوکاری هەموو گەلانی زوڵم و ستەملێکراوی ئێران سەراسەری خاکی مۆتە لێنیشتووی ئێران لە دەس چنگاڵی خوێناویی شای سەر بە ئەمریکا و دارودەستەکەی بێنینە دەرێ و ئازادی بکەین.

**ئاوارە** بەم هەستە پاک و بێجیاوازییە و بە دڵی پۆلایینەوە ئەو قسە بەسوودانەی دەکرد و گەلی زۆر لێکراوی کوردیش گوێیان بۆ قسە بەکەڵکەکانی **ئاوارە** ڕادەگرت و دەیانزانی و بۆیان ڕوون دەبۆوە کە شورشی کورد هەر تەنیا بۆ کورد تێناکۆشێ، بەڵکوو شان بە شانی گەلانی زۆر لێکراوی ئێران لە دژی ئیمپریالیزم و شای خائین خەبات دەکا بۆ ئازادی ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان. خەڵک زیاتر دەروونیان گەرم دەبوو و بە دەنگی ڕاپەڕینی کوردەوە دەچوون و هەرچی بە قازانجی گشتی بوایە لە یارمەتی

بە گیان و دڵ و ماڵ کەمتەرخەمییان نەدەکرد. لە ماوەی چەن حەوتوویەکدا نیزیکەی بیست تێکۆشەری کورد بە تفەنگەوە لە دەوری **ئاوارە** کۆ بوونەوە.

**ئاوارە** ئەمجارە دوو جۆرە مەسئوولیەتی بە ئەستۆوە بوو، یەکیان ئەوە کە بە نهێنی جووڵانەوەی سیاسی دەکرد، دووهەمیان سەرپەرەستی ئەو کۆمەڵە چەکدارە پارتیزانە بوو کە بۆ شۆڕش خاوخێزانیان و ماڵ و خانوویان بەجێ هێشتبوو دەگەڵ **ئاوارە** و هاوڕێکانی کەوتبوونە شاخ و بەندەنەکان. منیش کەوا ئێستا بە ئومێدی خودا لە نووسینی ئەم کتێبە بەسەرهاتە ڕاچووم لەو ڕاپەڕینە سیاسیە شۆڕشگێڕییەدا بەشداریم کرد و تفەنگم کردە شان و بە هیوا و ئارەزوویەکی زۆرەوە لە ماڵ دەرکەوتم. ڕووم کردە کێو و شاخەکان، دەستم کرد بە گەڕان لەو شاخ بۆ ئەو شاخ، لەو دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ، گەلێک بن ئەشکەوت و شیو و دۆڵم پشکنی تا **ئاوارە** و پێشمەرگەکانم دینەوە. هەر لە دوورەوە **ئاوارە** کە چاوی پێم کەوت، بانگی کردم و گوتی یاخوا



بەخێر بێی، وا دیارە بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردم. منیش یەک یەک ئەحواڵم پرسین و وەڵامم دانەوە. بەڵێ لەورۆژەڕا بوومە هاوڕێی ئەو پێشمەرگانە. هەرچەن کە لە پێش ئەو وەختەشدا هەمیشە هەر ڕەفیق و هاوسەنگەریان بووم، قسە و مەرامەمان هەر یەک بوو، بەڵام ئەوجارەیان کەمێک فەرقی هەبوو، فەرقەکەی لە باری فیکرییەوە نەبوو. هەموومان بیر و ئاواتمان یەک بوو، بەڵام فەرقەکە ئەوە بوو کە من تا ئەو کاتە لە ماڵەوە بووم و ئەوان بە شاخەوە، بەڵام ئەوا منیش هاتبوومە شاخ و کێو و ببوومە ڕەفیق و هاوڕێی ڕۆژ و شەویان. شێوەی ژیان و هەستان و دانیشتنمان وەک یەک بوو. بە یەکەوە دەڕۆیشتین، بە یەکەوە ماندوو دەبووین و دەشحەسانەوە، پێکەوە بۆ ئەستاندنی مافی زەوت کراوی کورد دەجەنگاین.

هەرچەن کە **ئاوارە** مەسئوولی ئێمە بوو، بەڵام کە سەیرت بکردنیایە هیچ فەرقمان نەبوو، هەموو یەک جۆر بەرگ و کەوشمان هەبوو، تفەنگەکانمان نەبێ کە

PDF 4 KURD

جۆراوجۆر بوون: برنەو، کەلاشینکۆف، وەسەت و تەیارەشکێن و ئی دیکەش. لە خواردندا یەکڕەنگ بووین، لە پاسەوانیشدا بە نۆرە هەموومان وەزیفەمان بەجێ دەهێنا. شەو و ڕۆژ وریا بووین، **ئاوارە** هەمیشە بە هۆی نامە و پەیامەوە لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانی کوردستانی ئێران کە لە ناوچە جۆراوجۆرەکان لە خەباتدا بوون پەیوەندی هەبوو و لە یەکتری بێئاگا نەبوون. هەر مانگی چەن جاریش لە سەر قەراری خۆمان لە جێگایەکی دیاریکراودا کۆ دەبووینەوە و وتووێژمان دەکرد و بیروڕامان دەردەبڕی، لەباری چۆنیەتی ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕییەکە قسەمان دەکرد. بە کورتی بڵێم مردن و ژینمان هەر یەک بوو.

لە باری شەڕی پارتیزانییەوە حیسابی بکەین ئێمە دەستەیەکی تەواوی پارتیزانی بووین، چونکە دەستەی پارتیزان نابێ لە بیست کەس زۆرتر و لە دە کەس کەمتر بێت. لە بابەت مەسەلەی سیاسی و چەکداریدا قسەی بۆ دەکردین. یەکێک لە ڕۆژەکانی هەوەڵی



مانگی بەهاری ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی بوو کە کۆ بووینەوە بەم جۆرە قسەی بۆ دەکردین و دەیگوت:

*ئەی پێشمەرگەکان! ئەی برادەرانی گیانی بەگیانی و هاوخەباتم! پێویستە هەموومان بەتێکڕا بزانین ئەو چەکەمان بۆچی کردۆتە شان؟ دیارە تفەنگمان بۆیە هەڵگرتووە کە خزمەتی گەلی چەوساوەی کوردی پێ بکەین، ئەو چەکە دەبێ بۆ ئەستاندنی مافی نەتەوایەتی کورد و ئازادی تەواوی ئێران بە کار بێت. تفەنگ بۆ جوانی و خۆنواندن نییە. تفەنگ بۆ ئەوە نییە کە هەر کاتێ ئارەزووت کرد بیتەقێنی، چونکە تەقە کردن بەخۆڕایی و بێموناسەبەت هیچ فایدەی نییە و تەنیا هەر خەساری فیشەکە کە دەکەوێ و بەس. چونکە زۆر پێویستە کە ئینسانی پارتیزان دەس بە فیشەکەوە بگرێ و بۆ ڕۆژی تەنگانە کە ڕووبەڕووی دوژمن بوو پیاوانە بە کاری بێنێت.*

دەیگوت:

*تفەنگ کردنە شان کارێکی زۆر ئاسان نییە. ئەو کەسانەی کە چەکدارن، لە پێشدا دەبێ ئاگاداری و زانیارییەکی تەواویان لە بارەی هەڵگرتنی چەکەوە هەبێ و هەروەها دەبێ زۆر بە سەبر و ئارامی لە دەستیەوەدا و کاتی چەخماخ ڕاکێشان ئەگەر فیشەکیشی نەخاتە بەر، نابێ لوولەی تفەنگەکە بەرەوڕووی کەس بکا، چونکە زۆر جار وا هەڵکەوتووە ئینسانی ناشی و لێنەزان لە کاتی دەس لە تفەنگ وەردانا زەلامێکی کوشتووە، یان برینداری کردووە. فێر بوونی دەرس و تەمرینی تفەنگ و کاتی بە کار هێنانی بۆ پیاوی چەک هەڵگر واجبە. دەنا پیاوی ڕێگر و چەتەش تفەنگ هەڵدەگرن و لە بەندەن و سەر ڕێگاکان پێش بە خەڵک دەگرن و بە زۆری تفەنگ ڕووتیان دەکەن.*

هەر بۆ ئیسبات و دەلیلی ئەوەی کە کردەوەی چەتە کارێکی ناحەز و خراپە بەسەرهاتی ڕابردووی



تاقمەیەک چەتەی بۆ گێڕاینەوە و کوتی:

*ساڵێکی شۆفێرێک کە ناوی ئارام دەبێ و لە جادەی نێوان سەردەشت و مەهاباددا کاری دەکرد، جارێک لە بەندەنی زمزیران چەتەی دێتە سەر ڕێگا و ماشێنەکەی پێ ڕادەگرن و موسافیرەکان ڕووت دەکەن و پووڵێکی زۆریشیان کە پێ دەبێ لێیان دەستێنن. بەڵام چەتەکان هەر بەم کارە پیسەیان واز ناهێنن و ئارامی شۆفیر لە ماشێنەکە دێننە خوارەوە و دەس دەکەن بە تێهەڵدانی و زۆری لێ دەدەن. ئارامیش لە تاو ئازاری لەشی هاوار دەکا و دەڵێ بۆچی لێم دەدەن؟ خەتام چییە؟ کەمم پووڵ بۆ هێناون؟ درەنگ هاتووم؟ لە دواییدا چەتەکان وازی لێ دێنن و دەڕۆن.*

**ئاوارە** زۆر بەسەرهاتی وەهای لەبارەی چەتاندا بۆ دەگێڕاینەوە. لە شێوەی ڕۆیشتن بە ڕێگاشدا **ئاوارە** مامۆستا بوو. کاتێک کە لە شوێنێکرا بۆ شوێنێکی دیکە

PDF 4 KURD

دەکەوتینە ڕێ، دەیگوت نابێ هەرگیز بە پۆل وەکوو مەل بڕۆین. پێویستە دوو کەس دوو کەس بە فاسیلەی دە میتر لە یەکتر دوور ڕێگاکەمان بگرینە پێش، جا لە سەر نەخشە شۆڕشگێڕیەکەی وی دەڕۆیشتین بە ڕێگادا. هەرکاتێک پێشمەرگەیەک لە ڕێگادا توند تێدەنووسا و پەلەی دەکرد، **ئاوارە** بە پێشمەرگەکەی دەگوت: *پەلە کردن لە ڕێگادا باش نییە، لەسەرخۆ ڕۆیشتن کارێکی باشە. چونکە ئەگەر توند بڕۆی بە ڕێگادا و لە ناکاو دوژمن بەرەنگارت بێ، ئینسان بە ماندوویی بە باشی دەستی بۆ ناکرێتەوە. جا کەوایە ڕۆیشتنی ڕێگاش لەسەرخۆ چاکە.*

**ئاوارە** دەروونێکی زۆر بەتوانا و بەهێزی هەبوو. نەدەڕووخا و نەدەترسا و ڕێی بەرنەدەدا، بێهیوا نەدەبوو. کە هەواڵی گیران و شەهید بوونی کاک فایەق (سولەیمان موعینی) و خەلیل شەوباش (خەلیلی مستەفازادە)یان پێ ڕاگەیاند کە بە دەستی نۆکەرانی ئیمپریالیزم لە کوردستانی عێراق شەهید کراون و کاک



فایەق لە مەرزی خانێوە تەسلیم بە دەوڵەتی چەپەڵی ئێران کرایەوە، **ئاوارە** پێی گوتین برایان ئەو دوو قارەمانە شەهید بوون، بەڵام ناوی کاک فایەق و کاک خەلیل شەوباش هەتا هەتایە لە ناو ناچێ و لە یاد و دڵ و دەروونی میللەتدا دەمێننەوە. بەڵام پەڕۆی سوور بە شانی قاتڵەکانیاندا دووراوە. خوێنی شەهیدان دەبێتە ئاوی ژیانی نەمامی باخی ئازادی و دێتە بەر، بەرەکەی هەموو ئینسانێکی زوڵم لێکراو لێی دەخوات.

**ئاوارە** لە ناو جەرگی میللەتی چەوساوەی کورد هەڵقوڵابوو، ئەو بۆ ستەم لێکراو و چەوساوەکان ڕاپەڕیبوو و دەجەنگا، کۆڵی نەدەدا و دەیگوت: *ژیان خۆش ڕابواردن و خۆ دوور گرتن لە خەڵک نییە، ژیان خۆپەرستی و تەکڕەوی نییە، بەڵکوو ژیانی بەڕاستی ژیانی ناو کۆمەڵانی خەڵکە، ژیان ڕاپەڕینە، تێکۆشانە، نەبەردە، کۆڵنەدانە، ژیان کۆمەک بە چەوساوەکانە، ژیان ئەوەیە کە لە سەر شاخێک بی و بەڵام لە ڕێگای خزمەتی خەڵکدا. ژیان نارەزایی دەربڕینە لە ئیمپریالیزم*

*و داگیرکەران. ژیان ئەوکاتە بەنرخە کە لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشدا بێت، ژیان خواپەرستی و ئیمانە، ژیان ڕاست کوتن و پاکییە، ژیان سەرکەوتنە بە سەر دوژمناندا، ژیان ئازادییەکی تەواوە.*

بەم جۆرە سەدان شەومان دەگەڵ **ئاوارە** کردە ڕۆژ. سەدان ڕۆژمان کردە شەو و دەیان ئەشکەوت و شاخمان پشکنی و دەیان شەو بێ‌ئەوەی یەک دەقیقە بخەوین و دەیان ڕۆژ بێ‌نان و چا تێپەڕ کران. زۆر جار بێ‌جلوبەرگ و پێلاویش دەبووین. ناخۆشی و خەفەتیش کە هەمیشە وەک هاوڕێی خراپ لەگەڵمان بوو.

**ئاوارە** هەر نەڕووخا و نەگۆڕا و وازی لە خەبات نەهێنا. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ دەرد و مەینەتی خەڵکی ستەم لێکراوی دێیەکان زیاتر بۆ خەبات هانی دەدا. هەر لەسەر داوا ڕەواکەی گەلەکەی سوور بوو و ئاوات و ئارەزووی ئازادی تەواوی ئێران و کوردستانی بوو.

**ئاوارە** بە هەواڵی شەهید کرانی سمایلی شەریفزادە



″مەلا عەزیز″ و میرزا محەمەدی شادومانی ″محەمەدی ئەستێ مەنگوڕ″ و حوسێنی ڕەحمان ڕابی و عەلی عەولا کۆڵی کە لە بەهاری **١٣٤٧**ی هەتاوی لە گوندی دارێنەی بانە بە دەستی مەئموورە خوێنڕێژەکانی دەوڵەتی شای بەکرێ‌گیراو شەهید بوون زۆر خەمناک بوو. بەڵام سەرەڕای ئەو خەمناکییەش هەر ئەو دڵی تەواوی برا پێشمەرگەکانی خۆش دەکردەوە.

**مەلائاوارە** بە تەواوی فیدایی و خزمەتگوزاری هەموو ئینسانەکانی کورد و ئێران بوو. بەڵام دەربەدەر و ئاوارەی دەستی چەتە خوێنمژ و بکوژەکانی دارودەستەی شای بەکرێ‌گیراو بوو. ئەو جەللادانە لە خەباتی بێ‌وچانی ئەو ئینسانە قارەمان و شۆڕشگێڕانە تۆقیبوون و نەترەیان چووبوو و ڕێیان بەردابوو. هەر بۆیەش ئەو خوێنڕێژانە بە هۆی نۆکەرە چڵاو خۆرەکانیانەوە تەڵەیان بۆ **مەلائاوارەی** تێکۆشەر نایەوە و توانییان بە هەزار کەڵەک و فڕ و فێڵ بیخەنە داو و تۆڕەوە.

PDF 4 KURD

**ئاوارە چۆن کەوتە داوی نۆکەرانی ئیمپریالیزم؟**

ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی ئاخر مانگی بەهاری ساڵی **١٣٤٧** هەتاوی بوو. ئەو ڕۆژە **ئاوارە** و تەواوی برا پێشمەرگەکان لە پەنای چیای بەرز و جوان و بەناوبانگەکانی "لانک" و "گیاڕەنگ" لە ناو جەرگی ناوچەی سوێسناندا دانیشتبووین و خەریکی چایی لێنان بووین. دوو کەس و سێ کەس لە بن تیر و گوێنییەکاندا بە نیازی کەمێک حەسانەوە بووین. چەن کەسیش لە برادەران کە بەیانی ئەو ڕۆژە چووبوونە تۆقەسەری کێوی گیاڕەنگ کاتی چێشتەنگاو گەڕابوونەوە و زۆریان کارگ دەگەڵ خۆیان هێنابوون.

پێشمەرگەکان ئەوجار دەستیان کرد بە برژاندنی کارگ. برادەرێک کە ناوی محەمەد بوو، "مەلا کەچە"یان پێ دەگوت نیزیکەی هەشت کارگی لەسەر پۆلووی ئاگرەکە دانابوون و وردە وردە خوێی پێوە دەکردن و دەیبرژاندن. منیش کە لە بن گوێنییەکدا دانیشتبووم، هەڵستام و بە لایەوە چووم. چونکە گاڵتە و



جەفەنگیشمان پێکەوە هەبوو، گوتم: مەلا مەرحەبا.

ئەویش گوتی: سەد جار مەرحەبا.

گوتم: مەلا ئەو هەموو کارگانە بە تەنیا دەخۆی؟ بەشمان نادەی؟

گوتی: بەڵێ بەڵێ، جوانی تێدەگەی. دیارە خۆت لێ ماشتوونەوە.

گوتم: مەلا، ئەو هەمووو تەماعەی ناوێ، بە چوار کەسانیش ناخورێن.

گوتی: کاکە، بۆ خۆم و بۆ مامۆستا **ئاوارە**یان دەبرژێنم.

گوتم: زۆرن، لێتان زیادن، با کارگێک بۆ من بێ.

گوتی: لێی ناخۆی، تۆش بهاتبایەی بۆ گیاڕەنگێ بۆخۆت کارگت بهێنایە.

وا دیار بوو ئەو بە قانوون دەبزوێتەوە و منیش مەبەستم جەفەنگ بوو. کە زانیم شەرعم لەگەڵ دەکا و بەشم نادا، گوتم: مەلا زۆر باشە و قسەکانت ڕاستن. بەڵام بە شوێنی کارگەکان نازانم، دەنا دەچووم. ئەویش ئاوڕی داوە و ڕووی کردە گیاڕەنگی، دەیەویست

لەوێڕا نیشانم بدات. من دەستم برد دوو کارگم لە نێو ئاگرەکە فڕاند. مەلاش کەوتە شوێنم و گوتی نەیانبەی، دەنا هەتا دەگەیە ئالانی هەر ڕێت دەکەوم. ئەو ڕۆژە بە گاڵتە و جەفەنگ لەگەڵ هاوەڵان ڕۆژەکەمان ئاوا کرد.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە وەک هەموو ڕۆژەکانی دیکە دوو کەس دوو کەس ڕیز بووین و کەوتینە ڕێ. شەو داهات و لە تاریکەشەودا گەیشتینە ئاوایی بەردەسوور. لە ماڵەکان نان و چامان خوارد. سێ کەس سێ کەس و چوار چوار لە ماڵەکان دانیشتبووین و پاسەوانیشمان بە نۆرە لە دەرەوە دەکرد. نۆرەی قۆڵی ئێمە تەواو ببوو. دەوروبەری نیوەشەو **ئاوارە** بانگی کردین و گوتی لە ئاوایی دیواڵان چەن کەس کێشە و نیزاعیان لە سەر پارچە زەوییەک لە نێواندا دروست بووە، ئەوانیش گوتوویانە شکایەت لە پاسگا ناکەین و **ئاوارە** لێپرسراویی ئەو ناوچەی بە دەستەوە. شکایەت لەو دەکەین. جا ئەوە خەبەریان بۆ ناردووم، منیش دەچم بۆ ناویان و ئاشتیان دەکەمەوە. ئێمە گوتمان چونێکی



قازانجی خەڵک بێت پێی ڕازین. ئەی ئێمە لەگەڵت نەیەین؟ گوتی: نا. هەر سێ کەس دەگەڵ خوم دەبەم و ئێوەش نێوانی شەو و ڕۆژان بچنە پەنا پۆلە گوێزەکانی ئەوسەری ئاوایی بەردەسوور. منیش لە دیواڵانڕا ئاگادارتان دەکەمەوە.

ئەمجا **ئاوارە** لەگەڵ مەلا کەچە و مامڕەحمانی وەتمان چاوشین و فەقێ ڕەحمانی شەخسە کە هەرسێکیان پێشمەرگە و خەڵکی ئاوایی دیواڵانیش بوون، لە بەردەسوورڕا بەرەو ئاوایی دیواڵان وەڕێ کەوتن. ئێمە لە سەر قسەی **ئاوارە** نێوانی شەو و ڕۆژان هەستاین و چووینە بن ئەو پۆلە دارگوێزانەی کە بۆی دەس‌نیشان کردبووین. دەوروبەری چێشتەنگاو لە دووڕا پێنج کەسی چەکدارمان بەرچاو کەوتن کە بەرەو ڕووی ئێمە دەهاتن. بە دووربین تەماشامان کردن. ناسیاو بوون، ئەوانیش پێشمەرگە بوون. لە دەشتی شنۆ و لاجانڕا هاتبوون کە **ئاوارە** ببینن و وتوویژی لەگەڵ بکەن. هاتبوونە ناودێی بەردەسوور، لەوێش پرسیاریان

PDF 4 KURD

کردبوو، چونکە ناسیاو بوون پێیان گوتبوون کە
پێشمەرگەکان لە پەنا فلانە پۆلە گوێزن. هاتنە ناومان،
سڵاویان کرد و بەخێرهاتنمان کردن و دانیشتین.
لێ‌پرسراویان کاک ساڵح لاجانی بوو. بە تەواوی
نەحەسابووینەوە کە نامەیەکی **ئاوارە**مان بە دەس گەیی
کە بریتی بوو لە مانەوەی ئەو لە دیوالان و چوونی ئێمە
بۆ سەرشیو و ناوی نهێنی شەو "سوورە" بێ و ئێمەش
هەموومان چووینە ئاوایی ناوبراو.

شەو داشکابوو. لە مزگەوتدا بووین کە لەپڕ یەکێک
لە نیگابانەکان بە گورجی هاتە ژوور گوتی لە حاستی
دیوالانڕا گوێم لە تەقەی سێ تفەنگ بوو. نەبێ و ببێ
شتێک ڕووی داوە. ئێمەش خۆمان خڕ کردەوە و
دەستمان دا تفەنگ و لە ژووری مزگەوت هاتینە دەرێ
و بەرەو ڕووی دێی دیوالان بە دەنگی تەقەکەوە
ڕۆیشتین. پێشمەرگەکان کە بیست و پێنج کەس
دەبووین دوای سەعاتێک لە ئاوایی دیوالان نیزیک
بووینەوە. یەکسەرە نەچووینە ئاوایی، بەڵکوو خەریکی



تاقی کردنەوەی دەوروبەری دێیەکە بووین کە تەقە
دامەزرا، چەن دەسرێژێکیان کردینێ. ئێمەش وەڵاممان
دانەوە. کە ئەو تەقەمان لێ کرا و ڕوون بۆوە کە
ژاندارمە و جاشەکان دەوری دیوالانیان گرتووە، دیاری
دا کە ئەو شکایەتی کە کرابوو دەسیسە و فێڵ و
کەڵەک بووە بۆ لە داو خستنی **ئاوارە** و هاواڵەکانی.
ئەمجا بە گورجی چووینە پشتی دێ و بە تاریکە شەو
سەنگەرن دروس کردن. هەتا بۆوە ڕۆژ چەن جار تەقە
کرا. کە بوو بە ڕۆژ جاش و ژاندارمەکان لە ترسان
هەموو خۆیان لە ماڵان هاویشتبوو و لە ناو ماڵەکانڕا
تەقەیان لێ دەکردین. ئێمەش نەماندەزانی ئەوجار
چۆناوچۆنیان تەقە لێ بکەین. چونکە دەمانزانی بێتو تەقە
بکەین ئەو هەژارانەی کە ئێمە خەباتمان بۆ دەکردن
وەبەر دەهاتن و دەکوژران. بە ناچار جاروبار کە
ژاندارمە و جاشەکان لە کەلێنڕا دەردەکەوتن
کەوکوژی دەستڕێژمان دەکردنێ. لەو تەقەدا چەن
ژاندارمە و جاش کوژران و بریندار کران. لە کاتی

PDF 4 KURD

گەرمەی تەقەدا ئافرەتێک کە کاغەزێکی پێ بوو لە ناودێڕا دەهات و هاواری دەکرد و دەیگوت: تەقەی مەکەن، نامەم پێیە بۆتان. کە گەیشتە لامان گوتی مامۆستا **ئاوارە** و هاوڕێکانی گیراون و نێودێ پڕ لە ژاندارمە و جاشە کە شەوێ هاتوون.

بۆمان دەرکەوت کە دەرمانی بێهۆش بوونیان بۆ لە ناو چێشتی ساوار کردبوون و بێهۆشیان کردبوون. هەر شەوێ خەبەریان دابوو بە سەردەشت لە پادگانێڕا ڕەوەیەک جاش و ژاندارمە بۆ گرتنی ئەوان هاتبوون. ئافرەتەکە گوتی ئەو کاغەزە سەروانی ژاندارمەکان داویەتی بە من تا بۆ ئێوەی بێنم. سەیرمان کرد بە کوردی نووسرابوو لە زمان **مەلائاوارە**وە بەڵام بە خەتی وی نەبوو. لە کاغەزەکەدا نووسرابوو برایان تەقەی مەکەن و ئەوشوێنە بەجێ بێڵن. من گیراوم. باوەڕمان بە کاغەزەکە نەکرد. ئافرەتەکەمان ناردەوە و تەقەمان گەرمتر کرد. لەو ماوەدا ئەو ژنە دوو کاغەزی دیکەی هەر بەوشێوە بۆ هێناین. کە هەموویان وەک یەک



نووسرابوون. ئێمەش جوانی کاغەزەکانمان لە کۆتاییدا بەو جۆرە بۆ سەروان نووسییەوە کە (ئەی سەروان بەنی عامیری هەرچی زووتر **ئاوارە** و ڕەفیقەکانی بەر بدە، بێ ئەوە دەنا دەس لە تەقە ناکێشینەوە و بەڵکوو ئێوە و ئاواییەکەش دەسووتێنین).

ئەم هەڕەشە تاکتیکی شەڕەکە بوو. دەنا ئەوەی ڕاستی بێ بە هەموو برا پێشمەرگەکان سەد فیشەک زیاترمان پێ نەمابوو. هەرچەن کە لە تەقە کردندا زۆر دەسبڵاو نەبووین، بەڵام بێ‌فیشەکی ببوو بە میوانمان لەو کاتە تەنگانە و وەختە خەتەرەدا. من دوو شتم هاتنەوە یاد و زۆر دڵتەنگ بووم و خەریک بووم بگریم. گریان لە ترسان نا، چونکە ترس بە میوانیش بە لاماندا نەدەهات. بەڵام بیرم دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دار هۆرەی لە خۆی نەبێ ناقەڵشێ، دەنا هیچ کاتێک ئیمپریالیزم نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ **ئاوارەی** تێکۆشەر بخاتە داوەوە. بەڵام دەسیسەی چڵکاوخۆرە خۆفرۆشەکان بە ئیمپریالیزم **ئاوارە**کان و

PDF 4 KURD

شۆڕشگێڕەکانی گەلانی چەوساوە دەخاتە داوی پیسی ئیمپریالیزمەوە و هەروەها هەموو میللەتێک ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش دەچێ و ئێمەش بەرەو پێش دەڕۆین. بەڵام لە زۆر شتانیشدا ناتەواوین و پێشکەوتنمان کەمە. دەنا چۆن هەشتا نەوەد ساڵ لەمەو پێش وەستا ڕەجەب ناوێک کە کورد بووە و لە شاری ئەستەمبوڵێ فێری سەنعەتی چەک دروس کردن بووە، بۆ "میرمحەمەد پاشای کۆری ڕەواندز"ی چەن تۆپی گەورەی دروس کردوون کەوا ئێستاش ئاساری یەک تۆپ لە بەردەرگای سەرای ڕەواندزێ ماوە، بەڵام ئێستا کە ئێمە لە سەدەی بیستەمدا دەژنی، کە سەدەی پێشکەوتنە بۆ دەبێ فیشەکی فیشەکئاسایی نەزانین دروس کەین؟ دەنا بۆچی ئێستا پەکمان دەکەوت؟

لەبەر ئەوەی دەوڵەتە داگیرکەر و چەوسێنەرەکان نایەڵن میللەتەکان گەشە بکەن گەلی ئێمەشیان لە هەموو شتێک وەدوا خستووە. هەر لەو پەرێشانی و بیر کردنەوەدا بووم جاروبار تەقەشمان دەکرد و ئەوانیش



تەقەیان لێ دەکردینەوە.

لەو ماوەیەدا چەن جاش و ژاندارمەی دیکەشمان کوشت و بریندار کرد. لەو کاتەشدا کە سەروان بەنیعامیری لە ترسان ویستبووی لە نێو دێدا خۆی حاشار بدا کاتی ڕاکردن عەمەلیاتەکەی پسابۆوە. هێلیکۆپتەرەکانیش بە سەر ئاواییدا دەهاتن و دەچوون. یەکێکیان چەن جار جاش و ژاندارمەی لە ناو دێدا دابەزاندن.

برا پێشمەرگەکان هاواریان دەکرد بۆ یەکتری کە بەڵێ وا بزانن هێزی ئێمەش زۆرە و کەم نییە، بەڵام ئەوەی کە ڕاستی بێ جارێکی دیکە گوتم بێفیشەکی بوو کە پشتی ئێمەی شکاندبوو. بە داخەوە لە هیچ شوێنێکی دیکەش هێزمان بە هاوارەوە نەهات. بە ناچاری و بە بێ فیشەکی ئەو شوێنە و سەنگەرەکانمان بەجێ هێشت.

هەر پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە هێلیکۆپتەر هاتبووە خوارەوەی ئاوایی دیوالان، **مەلائاوارە** و ڕەفیقەکانیان

PDF 4 KURD

بردبوون بۆ سەردەشت. هەر بەو هێلی کۆپتەرەش ڕەوانەیان کردبوو بۆ پادگانی نیزامی جەڵدیان کە ئەو کاتە لە لایەن ڕژیمی شای خائین و خوێنمژ دادگای سەحرایی لێ دانرابوو و بە هۆی ئەرتەشبود ئووەیسی کرابوو بە قەسابخانەی گەلی بێتاوانی کورد.

**ئاواره** و هاواڵەکانی دەورووبەری حەفتا و یەک ڕۆژ لە بەندیخانەدا ڕاگیران، بەڵام مامۆستا **ئاواره** ناوی هیچ ئەندام و هاوڕێیەکی نەهێنا. لە بەرەبەیانی ڕۆژی **٩**ی مانگی گەلاوێژی ساڵی **١٣٤٧**دا هەر بە هێلی کۆپتەر ڕەوانەی شاری سەردەشتیان کردبوونەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە لە سەر کەنەکان خوارەوەی شار بە دەستی ژاندارمە خوێنخۆرەکانی حەمەڕەزاشا تیرباران کران. لە پێش ئەوەدا کە تەقەیان لێ بکرێ **ئاواره** بە سەر داری ئیعدامەوە نەڕاندبووی و بە ژاندارمەکانی گوتبوو:

*ئەی خوێنڕێژەکان، ئێوە دەتوانن هەر من و ڕەفیقەکانم بکووژن، بەڵام بزانن لە پاش کوژرانی ئێمە هەزاران* ***ئاواره*** *و مامڕەحمان و*



*مەلا کەچە دروس دەبێ. چونکە جووڵانەوەی میللەتەکە بە کوشتنی ئێمە و سەدانی دیکە کۆتایی نایە و ناکووژێتەوە و تا ڕووخانی ڕژیمی شا و ئازاد بوونی گەلانی ئێران هەر درێژەی دەبێ.*

لە دوای ئەو شوعارە توندانە چەتە خوێنڕێژەکان دەستڕێژیان لێ کردبوون و هەرسێکیان نامەردانە شەهید کردن و ئەو سێ قارەمانەش چوونە پاڵ شەهیدانی دیکەی کوردستان و ئێران.

قسەکانی شەهید **ئاواره** هەموویان ڕاست و بەجێ بوون. پێشبینییەکەی تەواو بوو، چونکە بە شەهید کرانی ئەوان چرای خەباتی گەلەکەمان نەکووژایەوە و بەڵکوو گڕی زیاتریش خۆش بوو تا ڕژیمی چەپەڵی شای ڕووخاند.

تەرمی ئەو سێ شەهیدە بەڕێزانە لە داوێنی کێوە جوان و بەرزەکەی گردەسوور لە تەنیشت شاری سەردەشت نێژران و گۆڕەکەیان بۆتە جێی شانازی

PDF 4 KURD

نەتەوەکەمان و یادی ئەو شەهیدانە هەتا هەتایە لە دڵی میللەتدا دەمێنێ و لە ناو ناچن.

خاکەلێوەی ١٣٥٨ی هەتاوی

سەرکەوتوو بن.



ئاوارەی نەمر بەر لە ئیعدام، کاتێ لە دژی رژیم قسەی ئاخری دەکات.



**هاواری تووتنەوانێکی ناوچەی سەردەشت**

تووتنەوانێکی هەژارم
بێخانوو و بێزەوی و زارم
منداڵم ڕووت و برسییە
ژیانم پڕ مەترسییە
رووم نییە بچمە نێو خەڵک
بێبەرگ و پێڵاو، بێ کەڵک
بەڵام چ بکەم چارەڕەشم
خەرمانم زۆرە و بێبەشم
خۆم و خێزان، گەورە و بچووک
رادەپەڕین وەکوو هەلووک
یا قوڕەکاری و خشتەبڕین
یا جووتە و زەوی هەڵدڕین
بە گاسن، پێمەڕە، بە پاچ
بە چنگ و نینۆک و بە قاچ

ئەوجا توو و شەتڵ پێ دەکرێ
بە چیلکە و چاڵ سەری دەگرێ
بزاری چەن ناخۆش و ورد
پیشەیی کوڕ و کیژی کورد
زەوییەکەم بووره، دێر بکەم
نەوەک سیس ببن شەتڵەکەم
دێراو هەڵدان، خاکاو کردن
کوڕ و کچ وەکۆوە کردن
بێپوول و باغ و بزن و مەڕ
دوورم لە خێر، نزیک لە شەڕ
قەرزدارم، دەردەدارم
شەرمەندەی خەڵکی دێ و شارم
خەڵکی پێی وایە تەمبەڵم
بێکەسب و کار و چەپەڵم



هەرکە کوتیان سەری ساڵە
وادەی جووت و کشتوکاڵە
هەڵدەبەزین لێرە و لەوێ
بەڵکوو کارێکمان دەس کەوێ
وا بەهارە دەرکەوت گوڵ
جێگە خۆش دەکرێ بۆ شەتڵ
دەیبێژین و خۆشی دەکەین
تێکەڵ دەبێ لە گەڵ پەین
دوو ڕۆژ جارێک ئاوی دەوێ
تا شین دەبێ و دەردەکەوێ
شەو و ڕۆژ خەو ناچێتە چاو
کەنگێ بەرم کەوێ ئاو؟!
بە شێوبڕین و وەرد و خەت
کێڵان دەگاتە پێنج کەڕەت
ناخۆشە تووتن چەقاندن
هەڵترووشکان و پشت چەماندن

لە ئاو داشتن سستی نەکەی
تا دەگووریٚ وشکی نەکەی
نۆرەی پشک و بژاربڕە
جەرگبڕە، بژار پڕە
وا نیوگوڵ کرا ئاو درا
لە دوورەوە بەرچاو کرا
کڵاو کەرگەری وەدەرکەوت
ئەژنۆم شکا، نێوکم کەوت
رەببی کوێر بێ و چاوی نووسێ
بە زیادم لە سەر نەنووسێ
دەردی پێرارم نەگاتێ
نە کەسریم بێ و نە چیم داتێ
***تووتننووس، بۆ خاتری خودا***
***روحمێ بکە بە منی گەدا***
***مەیسووتێنە ڕەنجی ساڵم***
***خاوەنی کۆشێک منداڵم.***



*تازە هەڵیوەشێنمەوە*
*بشمری نایکوژێنمەوە.*
*من کاربەدەستی دەوڵەتم*
*دوژمنی خاک و میللەتم!!*
زۆر لەبەری پاڕامەوە
بێ پووڵ جوانی نەدامەوە
نووسی بە چڵ پووتی تەواو
تەپڵە بە سەری دوا بڕاو
بە فیزەوە سوار بوو ڕۆیی
بو من چی ما؟ ڕەنجەڕۆیی
ئەوجا بارین دەرد و بەڵا
بۆ تووتنەوانی بێسەڵا
بە لەرز و تا، بە دەردی چاو
سیس بووم وەک تووتنی بەر هەتاو
بێ پووڵ و پارە، بێخەرمان
بێ دوکتۆر و داو و دەرمان

کرم و ملەش، کەڵە و گەزۆ
لە تووتنی تایین بوون وەکو
ئەویش وەک من سیس و داماو
چرچ و بێشەفاف و ژاکاو
نەخۆش و هەژاریم بران
کارم زۆرە، دەردم گران
جوچکە وەچە، سەر پسان
بن پەل تەڕە داشکان
چارداخ و بەن پێوە کردن
وەبەر تاو دان و وشک کردن
تەلیس، شریت و حەمباڵی
خەسار نەکەی نیو مسقاڵی
ئەوا داگیرا و دانرا
پەتەی بار کردنی درا
خۆشی خۆشی دڵم شادە
خاوەن قەرز بەس خۆ بادە!



تووتنەکەم زۆر جوان و ڕەندە
بۆن خۆش و باش و پەسەندە
ئەورۆ و سبەی باری دەکەم
وارید بە ناو شاری دەکەم
دوخانیە چاکم لێ دەکڕێ
پوولێکی باشم پێ دەبڕێ
هەر قەرزێکی بە سەرمەوە
دەیدەمەوە بە گەرمەوە
جلک و پێڵاو، دەسرە و کڵاو
برنج و ڕۆن، بۆ چڵاو پڵاو
هەرچی پێویستە بۆ ماڵم
بۆ خۆم و ژن ، بۆ منداڵم
هەمووی دەکڕم بە هەرزانی
لە چاو ساڵان بە مەرجانی
قەرزدار نیم، نەخت کڕم
چیدی ناڵێم بەرگشڕم

PDF 4 KURD

حاجی قادر، عەلی قەساب!
چایی بێنن لەگەڵ کەباب
شەو لە ئوتێل لە سەر فەنەر
دەخۆم، دەنووم بە بێ خەتەر
بە ڕۆژ تا شەو بازاڕ پێوان
بە فیزەوە قەدەم لێدان
دەگەڕێم دووکان بە دووکان
سەودا دەکەم جلکی بووکان
لە دەرزی تاکوو پەشمینە
هەر شتێ جوان و ڕەنگینە
نرخ و قیمەتی دەپرسم
تووتنم هەیە، چاو نەترسم
منداڵیش تلی تلییانە
لە ماڵێ خۆشی خۆشییانە
باب لە شار دەگەڕێتەوە
هەموو شتێکمان بۆ دێتەوە



دوو ڕۆژ بەم جۆرە ڕامبوارد
بە قەرز نان و چاییم خوارد
دڵ پڕ لە ئاهەنگ و خۆشم
ئەمڕۆ تووتنەکەم دەفرۆشم
ئاغای ڕەئیس وەدەرکەوت
ئۆخەی نۆرەم وەبەر کەوت
دە فەردە تووتن ڕیز کراو
لە بەر شەوقی هەڵنایێ چاو
بۆ دیتن و چاو لێ کردن
هەمووی پەرت و بڵاو کردن
سەر و بنی هەڵتەکاندن
نیوەیەکی لێ وەراندن
منیش لە جێی خۆ هەستاوم
بە بێ زمان ڕاوەستاوم
لە ناکاو هاتە گوێم دەنگێ
دای لە جەرگم وەک خەدەنگێ

PDF 4 KURD

گوتی: لێدەن بە واگوزار
ئەمساڵ خراپترە لە پار
بە ڕوویەکی ترش و تاڵەوە
گوتی زوو بگەرە ماڵەوە
دە پووتت کەسری لە سەرە
بیهێنە بێ بێنە و بەرە
کە گوێم گرت لەم دەنگ و سەدا
ڕەق بووم لەوێ وەک مقەبا
پاش تاوێ تاسان، حەپەسان
بە دەنگێکی پڕ لە ترسان
هاتمە زمان، هاوارم کرد
لێم وەکو بوون درشت و ورد
کوتم: *هەی داد و هەی هاوار*
*هەر لە ڕێگەی پەروەردگار*
*ئاغای ڕەئیس! قەرزدارم*
*نەخۆشم، برسیم، هەژارم*



*هیچ نەبێ قەرزی ئەمساڵم*
*قووتی خێزان و منداڵم*
*بمدەنێ با ئەربابەکەم*
*هەقی چایی و کەبابەکەم*
*ڕازی بکەم بیدەمەوە*
*ڕێم بێ بۆ شار بێمەوە*
*یا بمگرن، یا بمکوژن*
*یا کەسریم لە سەر هەڵگرن*
*بمبەخشن لە ڕێگەی خودا*
*خەرجیم نییە بۆ دادگا*
هەڵدەلەرزیم هەڵدەچۆقام
نەڕاندی بە سەرما، تۆقام:
**ئەی بێشەرمی پەردە دڕاو**
**ئەی چڵمنی پیس و گلاو**
**بێدەنگ نەبی، بێئابڕووو!**
**تێت هەڵدەدەم بە ئارەزوو**

PDF 4 KURD

**دا کوڕینە، لێرە دەری کەن**
**نەک لێرە، شاربەدەری کەن**
بەم چەشنە دەریان پەڕاندم
بەرهەمی ساڵیان فڕاندم
بە دزی خاوەن قەرز و ئەرباب
بێ پووڵی قاوەچی و کەباب
ملم بۆ نا بە لارەوە
دەرکەوتم لە ناو شارەوە
بە چاوی پڕ گریانەوە
بە دڵێکی وەک بوریانەوە
هاتمەوە ناو خاو و خێزان
وەک بارانی گەڵاڕێزان
فرمێسکی ڕووتی و هەژاری
لە چاوی گشتمان دەباری.
**دوژمن تاکەی بدەم باجت**
**دەک وەرگەڕێ تەخت و تاجت**



**ئەی وەرزێڕان، ئەی جووتێران**
**ئەی تووتنەوانی ماڵوێران**
**با یەکدڵ و یەکزبان**
**بە خەباتی شێلگیرمان**
**تا دوا پشوو هەوڵ دەین**
**شەق دەو ڕەژیمە هەڵدەین**
**یەک گرتن هۆی سەرکەوتنە**
**خەبات ڕێگەی دەسکەوتنە**
**ئەگەر یەک بین و یەک بگرین**
**لەگەڵ یەکدا بژین بمرین**
**زاڵ دەبین و سەر دەکەوین**
**بەرز دەبین و نانەوین**
**هەوڵ و تەقەللای بێوچان**
**بێ ماندوویی و بێپشوو دان**
**تاقە ڕێگەی ئازادییە**
**هێنەری ڕۆژی شادییە**

PDF 4 KURD

(لە دوازدەی شەشی چل و شەشدا سەعات دوازدەی بەیانی لە یەکێک لە چیا بەرز و سەخت و سازگارەکانی نیشتمانی ئازیزمان کوردستانی ڕەنگین لە ژێر کەپرە شینکەیەکی خنجیلانەی نەشمیلانەدا کە چۆڕەچۆڕی کانیاوە ساف و ساردەکەی تەنیشت کەپرەکە، قاسپەی کەو و کەوبارە نەخشینەکانی دەوروبەریان تێکەڵ بە شنەشنی شەماڵ و بای کوێستان کە دەیدا لە لقوپۆپی دار و دەوەن، وەک لایە لایی دایکێکی دڵسۆز کە لە حەدەحەدی نیوەشەوی گەڵاڕێزانی پایزدا، بە دەنگێکی نەرم و ناسک و خۆش کۆرپەی تاقانە و خۆشەویست بلاوێنێتەوە، لە پەردەی گوێچکەماندا دەزرینگایەوە و هانی دەداین بۆ ئاهەنگ و هەڵبەستی هەڵپەڕکە و گۆرانی، بەڵێ ئا لەم شوێنە و بە هەوای خۆش و دڵگیری ئەمانە بووژامەوە و هاتمەوە حاڵ و ئەم پارچە هۆنراوەم نووسییەوە تا ببێ بە یادگار، هەرکاتێ لە هەر شوێنێ خوێندرانەوە، ئەوانەی ناحەزن تف و نەحلەت و نفرینێکی زۆر و ئەمانەش کە دۆست و برادەر و هاوڕێن



دوعا و سلاو و ڕۆژباشێکی لەبەردلانم بۆ بنێرن و یادم بکەن و وەبیریان بێمەوە.

**ئاوارە ـ ١٣٤٦/٦/١٢**

## ڕەشبگیری

قەڵەم ! ئەی نووری چاوم  
کزەی جەرگ و هەناوم  
ئەی مایەی ژیانم  
ئەی هێزی دڵ و گیانم  
هەستە لە خەو، درەنگە  
ئیمڕۆ دڵم زۆر تەنگە  
دڵم زۆر ماتەمینە  
پڕ لە زام و برینە  
چت پێ دەڵێم بە کوردی  
بینووسە زۆر بە وردی  
وام زانیوە دەنگ و باس  
سێ جەندرمەی خوانەناس  
لە سیی شەشی چل وسێ

PDF 4 KURD

هاتنە بێژوێ سێ بە سێ
بەرگیان سپی وەک خێوی
ترسەنۆک چەشنی ڕێوی
گەینە قەبرستانی دێ
"سەلیم"یان گرت دەسبەجێ
کە گرتیان سەلیم پێخواس
خەڵک هەموو وەک هەیاس
لە فیتی خۆ گەیشتن
هەرایان کرد ڕویشتن
هاتن گەینە نێو ماڵان
گەڕان کۆڵان و داڵان
لەناکاو و بێخەبەر
یەکێک لە ژوور هاتە دەر
نەیزانی ئەو فەقیرە
کە حەوزەیە و ڕەش گیرە



نەیزانی بەشی کوردان
گرتنە و کوشتن و زیندان
وەک سەگ بۆی چوون دەمودەست
گرتیان، هەردوو دەستیان بەست
بە خۆشی و شادمانی
هاتن گەینە سەربانی
وەک سەگی هار و برسی
هەرچی دێ لێیان پرسی
غەیری ئەو دوو نێچیرە
کەسیان نەبوو دەسگیرە
هەرچۆنێ بوو مام پێخواس
خۆی لە دەس کردن خەلاس
ئەوی تریان پێش خۆ دا
بۆ وەتاخی مام کوێخا
(ای کدخدا بیا پیش
بیا بیرون، میندیش)

PDF 4 KURD

بەڵام کوێخا مەردانە
دەرچوو لەو جێ و مەکانە
زوو گەڕەوی خۆی بردەوە
بۆی دەرچوو و خۆی شاردەوە
ئەو شەوە تاکوو بەیان
پیر و ئافرەت دەورەی دان
زۆریان لێ پاڕانەوە
دیلیان وێ نەدانەوە
بە بەرتیل و بە پارە
نەکرا عیلاج و چارە
تا بەیانی دەسبەستە
خستیانە ژوور وەک خەستە
چەند و چۆنی پێ ناوێ
دەگەڵ گزنگی تاوێ
سێ جەندرمە و یەک ئەسیر
هاتنە خوارێ چەپ و چیڕ



هاتنە خوارێ چوار بە چوار
کەوتنە ڕێگا بەرەو شار
خەڵکی نێودێ ژن و پیاو
کوڕ و کچ و پیر و لاو
هەموو مات و خەفەتبار
وەک دێیەکی تازیەدار
بەڵام هەرگیز خودایە
شوکری تۆم لە دەس نایە
کوردت وەها داناوە
بۆ تەنگانە ژنیش پیاوە
ئافرەتانی قارەمان
دایاننابوو یەک پیلان
نەخشە و پیلانێکی جوان
وەک داستانی ئەرسەلان
گەینە دەرکی مام تاهیر
پێش خۆیان دابوو ئەسیر

PDF 4 KURD

یەک دەیگوت ئامۆزا گیان

ئەتۆ و سەربازی ئێران؟!

یەک دەیگوت کوڕی خوشکە

بۆیە لێوم وا وشکە

یەک دەیگوت ئەی ئامۆزا

جەرگم لەبۆت هەڵپڕووزا

کە هات خورشیدی کچی

دەیدا لە سەر و پرچی

هاواری کرد: *دایە گیان*

*بێ مرادت کردم لە ژیان*

*شەرتە لە پاش تۆ دایە*

*تەرک کەم ئەو دونیایە*

*تا خەوم نەیە نەنووم*

*تا بنێشتم نەبێ نەجووم*

*تا برسیم نەبێ نەخۆم*

*تا نەکەومە رێ نەرۆم*



پوور فاتمیان ناردە پێش

کردی بە مرخێش مرخێش:

**کوڕی منە و بەری دەن**

**سەگباب، ئەزیەتی مەدەن**

تێی هاڵان و تێی نووسان

وەک جۆخین کەن پێی خووسان

زۆریان یەکتر هێنا و برد

زەفەریان بە یەک نەبرد

پوورم نەرعەتەی کێشا

هێزی ئافرەت خرۆشا

بگرە و بەردە و گیر و دار

پەیدا بوو لە چوار کەنار

یەک دەیگوت تێیان هەڵدەن

زوو براکەمیان پێ بەردەن

یەک دەیگوت من هەر دەیکەم

تا کورەکەم رزگار دەکەم

PDF 4 KURD

*مەگەر هەر نەبێ ماستاو*

*دەنا ناخۆم بەفر و ئاو*

*مەگەر لەبەر هەژاری*

*گۆشت بکەم ژەهری ماری*

*چا ناخۆم تا تێ نەکرێ*

*نان ناخۆم تا دانەنرێ*

لەم هەموو باس و خواسە

سەرباز بوون گێژ و کاسە

لە دوای شین، گریان و زار

خورشید دەستی دایە دار

وەک شێرەژنی زەمانە

گرتی جەرگی مەیدانە

سەرباز لەو ترس و لەرزە

لە بیریان چۆوە حەوزە

بە سەد فێڵ و دەردیسەر

خۆیان لە دەس بردە دەر



چوون لە ژوورێ دانیشتن

وەک مریشک لێی هەڵنیشتن

جا پوورە فاتمی مردوو

لە سەر خۆی لادا پەتوو

رزگاری بوو لە مردن

بۆ تووتن پێوە کردن

داستانم تەواو نەبوو

داخەکەم ڕۆژ ئاوا بوو

جێگام چۆڵ و بیابانە

نیمە چرا و دیوەخانە

گەلی خوشک و برایان

تکا دەکەم لە گشت لایان

لە تەخسیرم ببوورن

ئەوەی نیزیک و دوورن

PDF 4 KURD

## بخوێنەوە و ئالان بناسە

ئالان! ئەی باغ و بێستان
ئەی ناوچەکەی کوردستان
ئەی بەهەشتی سەر زەمین
ئەی نەخشی جان ئافەرین
من بەشی خۆم گەڕاوم
جیهان هاتە بەرچاوم
نەمدی وێنەی تۆ چ شوێن
هەم کوێستان و هەم گەرمێن
خۆشی، لەبەر دلانی
تا چاو حەز دەکا جوانی
لە هەرزنی دێتە بەرچاو
مێوژ و دۆشاو بە لێشاو
گاکێ و تێپەت و بەردان
جێی مەڕ و ماڵ وەدەر نان



توتنەکەی زەردەکانی
رۆژمەن بێ بە قوربانی
پیربابا پیری مەشهوور
خەڵک لە نیزیک و دوور
لە کوێستان و لە گەرمێن
بەرەوپیلی دەچن و دێن
بادار و سەر بە هەوێ
جێی وایان دەس ناکەوێ
ئاوەدان بێ مەزناوە
مەڵبەندی بەڵەکچاوە
لە کێو لە مازوو چنین
بە هەڵپەڕکە و پێکەنین
بە دابی هەرزەکاری
دوور لە دنیای خەمباری

شەو و ڕۆژ ڕادەبوێرن
دەس و دڵ و چاو تێرن
خوارەوەی خوارەمیرە
کۆنەجێی مەزن و میرە
ئەشکان و مەزرێ و گەرماو
خاوەن دەغڵ و تووتن و ئاو
بێتووش باخچەی گوڵانە
هێلانەی بولبولانە
کوڕ و کچ و لاو و پیر
هەموو دڵخۆش و دڵگیر
باخ و باخاتی جوانی
مزگەوت و حەوز و کانی
دار و درەخت و سەوزە
ئاوی سارد و بێقەوزە
هەتا دنیا دنیا بێ
وێنەیان پەیدا نابێ



میوەجاتی جۆر بە جۆر
زەرد و سوور و شین و بۆر
شیرن، مزر و مەزەی خۆش
پیاو دەکەن مەست و سەرخۆش
خوڕەخوڕی ئاوی کوێستان
دێتە خوار بۆ نێو بێستان
چریکەی بولبول، قاسپەی کەو
هەر لە بەیان تاکوو شەو
بە ئاوازی ساز و خۆش
دڵ دێننە جۆش و خرۆش
شاخی بە بەفر و بەرزی
دەڕوانێتە سەر حەرزی
مەلا عەولای بێتووشی
هەزار ڕەحمەت بێ تووشی
ڕۆڵەی ئەم خاک و ئاوە
لە دنیادا بە ناوە

PDF 4 KURD

نە بە زمان نە بە قەڵەم

ناتوانم مەتحی بکەم

تورک و فارس و ئەرمەنی

کورد و ڕۆم و یەمەنی

کەس نییە ناوی نەزانی

چم داوە لە بەیانی

بێتووش بەڕاستی خۆشی

مەڵبەندی عەیش و نۆشی

چۆن مەدحت بە من دەکرێ

هەر ئەوەندەم پێ دەکرێ

قەت دەرنەچی لە یادم

هەر بەوەندەش دڵ شادم

مێرگاسی جوان و ڕەنگین

سازگارە و جێگەی هاوین

جێی ئاهەنگ و سەیرانە

دڵگیری پیر و جوانە



"دولکان" و "کانیلان"ی

سەد دڵ دەبێ حەیرانی

لە "مێشکەپە" و "ڕەجاکە"

مام حاجی پیاوی چاکە

بێشکە و دێگە و بالێتان

شیرانیان و دیناران

سەرووی دیناران بناوە

دێیەکی خاوەن ئاوە

گەیشتە بێژوێ نۆبە

جێی زکر و دین و تۆبە

جێی تەدریس و مەدرەسە

دوورە لە درۆ و دەلەسە

شێخەمینی ئەمیندار

پیاوی خودا و خوێندەوار

زۆر بەناوبانگ و ناو بوو

قیبلەگای پیر و لاو بوو

PDF 4 KURD

هەرکەس ئەوی ناسیبوو
فێری خودا ناسی بوو
پیت و بەهرەی خودا بوو
بۆ سەر زەوی ڕژا بوو
سەرچاوەی نەقشەبەندی
خۆزگەم بەوەی چۆ بەندی
هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی
یەزدان بێ چاوەنۆڕی

## مووچەکانی بێژوێ

"قوڵە" و "موونە" و "بەردەسوور"
"مەزرێ" هەمووی خوار و ژوور
هەم "گۆجار" و "سێ کۆزوو"
کوروێ و داری و دار مازوو
لە گوێزلی هەنجیر و ترێ
هێندە زۆرە ناگوترێ



گرتکی هەر ئاوەدان بێ
هەتا سەر خانەدان بێ
کاوژان لەوبەری گرتکی
زۆرن مێوژی بەکەڵکی
هەزار سڵاو لەو گوندە
لەو بێژوە ڕەند و مەندە
بێژوێ بەهاری شادی
لە ئالان بۆتە نادی
سەد و بیست ماڵ باڵایە
هەمووی ئاڵ و واڵایە
کوڕ و کچ و لاو و پیر
هەموو زانا و عەقڵ و ژیر
دڵ خۆش و دەم بە خەندە
شینی وێنەی گۆوەندە
پیری بە کەیف و دڵ جوان
لە دەوڵەمەند تاکوو شوان

PDF 4 KURD

هەموو شیرن کەلامن
پڕ عەقڵ و هۆش و فامن
کوڕ و کچی هەرزەکار
فێری گۆنگەڵ و قومار
لاوی گورج و گۆڵ و توند
دێتە بەرچاو لە نێو گوند
کوڕان شێر و پڵینگن
کچان قاز و قولینگن
کانی مزگەوت و چنار
مەلا و فەقێ و خوێندەوار
هەر لە بێژوێ جوانن
پێکەوە شان بە شانن
بێژوێ! هەتاکوو ماوم
لانەچی لە بەر چاوم
با لەو سەری دنیا بم
ئەگەر لە تۆ دڵنیا بم



هەر پێم وایە لە لاتم
هاودەنگی خاک و پاتم
ئەو جا بە خوات دەسپێرم
بێژوێی بەخێر و بێرم
خوات لەگەڵ بێ بێژوێی خۆش
شەرتە نەتکەم فەرامۆش
"سنجوێ"، "دۆلی" و "ڕەشەکان"
بمبەخشن بە هەرسێکان
هەر ئەوەندەی دەزانم
بڵێم هەتا دەتوانم
جێی گەورە و خانەدانن
خاوەن قۆناخ و نانن
"گرویس" لەبەر دڵانی
وەک گوڵی سەر چڵانی
خاوەنی زەوی و زاری
جێی هەنجیر و هەناری

PDF 4 KURD

تەماتەی بەهارانت
مرەبای هەنارانت
گڵەسپی، مێرگان و زێوە
شێخەسووری کرێوە
دەورەی "ئەڵمان"ی داوە
یاخوا هەر ببن ئاوا
مەلا پیرە و شێخەسوور
دوو مەرقەدی پڕ لە نوور
جێگەی ڕاز و نیازن
دوعایان لێ دەخوازن
لە هەموو گۆشە و کەنار
لە دێهات و لە ناو شار
پۆل پۆل و دەستە دەستە
بێ ماندوو بوون و خەستە
بەرەو پیلیان دێن لە دوور
زیاتر لەبەر شێخەسوور



بەتایبەتی بەهاران
بە کۆڵەپشت و باران
کولێرە و نانە چەورە
بە لێشاوە لەو دەورە
زۆر جار بە بەزم و ئاهەنگ
کوڕ و کچی شۆخ و شەنگ
دەگرن دەستی ڕەشبەڵەک
زەرد و سوور و چاو بەڵەک
با لێرە دەس هەڵگرین
بچین هەڵپەڕکێ بگرین

١٤ی گەلاوێژی ١٣٤٦

PDF 4 KURD

## کوردم کوردستانم دەوێ

هەدا نادەم ڕۆژ و شەوێ
خۆم بسرەوم دڵ ناسرەوێ
تاکوو هەلم دەس دەکەوێ
دنیا گشتی سەر یەک کەوێ
لێم ببڕن خۆراک و خەوێ

**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**

تاکوو قۆناخی سەربەستی
ئەسپی خەباتم ناوەستی
تا دەرنەچم لە ژێر دەستی
نامەوێ سەرمایەی هەستی
مەرگ، نەک ژینی ژێر دەستی

**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**



بۆ ئازادی و خودموختاری
بۆ سەربەخۆیی و ڕزگاری
بە سەربەرزی و بەختیاری
بە گیان دەکەم فیداکاری
تا دەبڕم کلکی زۆرداری

**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**

کلکی زۆردار دەقرتێنم
قەڵای سەختی دەڕووخێنم
بەردی بناخەی دەردێنم
وەک دیڵەسەگ دەیتۆپێنم
کە نەش تۆپا دەیڕەتێنم

**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**

PDF 4 KURD

دەیڕەتێنم تا کێوی قاف
جیهانی پێ دەکەم تەواف
بە بێ گاڵتە و لاف و گەزاف
شەرتە نەکەم وەعدە خیلاف
یا بمرم یا بستێنم ماف
**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**
دەستێنمەوە مافی خوراو
بۆ نیشتمانی بەش کراو
هەزاران دایکی زگ سووتاو
هەزاران لاوی سەربڕاو
دەژیەنمەوە وەک گوڵ بە ئاو
**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**



من ناهێڵم نەسلی بەدکار
وەک هەڵۆ لێی دەکەومە کار
بچتە ئاسمان نایکەم قوتار
لە ژێر زەوی بۆی دەچمە خوار
لێی ناهێڵم یەک جووقەوار
**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**
جووقەواری لێ ناهێڵم
وڵاتی پێ بەجێ دێڵم
خاکی خۆم بۆ خۆم دەکێڵم
سوودی بزن و مەڕ و چێڵم
چیدی نایدەم بە فڕ و فێڵم
**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**

PDF 4 KURD

تا کەی خەزێنە و نەوتەکەم
بە بووکۆڵە و فیتفیتە دەم؟
خەڵک شاد و من دڵ بە خەم
لە سەر گەنجی وڵاتەکەم
خاکی خۆشم ئاوارەکەم
**کوردم و کوردستانم دەوێ**
**هیوای بەرزم قەت نانەوێ**

١٣٤٦ی هەتاوی



## ئێمە کە ناو کۆمەڵی پێشمەرگەی خاکین

ئێمە کە بە ناو کۆمەڵی پێشمەرگەی خاکین
پێش‌دەست و فیداکاری هەموو کوردێکی چاکین
دەس‌هەڵگری سەر، ماڵ و کوڕ و بابین و داکین
چونکە بە دروستی ڕەگەزی کاوەیی پاکین
**بۆیە لە شەڕی دوژمنی گەڵ هێندە بێباکین**
لەو کاتەوە خەلفی قەد و باڵای مە چەقاوە
بە خوێنی شەهیدانی وەتەن ئاوی دراوە
چونکە لە مەمەی کوردییەوە تێر کراوە
هەر بۆتە دلێری و نەبەزی هەرچی خوراوە
**بۆیە لە شەڕی دوژمنی گەڵ هێندە بێباکین**
تا ئەورۆ لەبەر تەفرەقە، گەر ماف خوراوین
ئێستاکە هەموو یەک دڵ و یەک زار و تەواوین
بڕوانە بۆ سەر سەنگەری دوژمن چ بەتاوین

PDF 4 KURD

چونکە لە بەرەی پاکیزەی ئەیبووبی بەناوین

**بۆیە لە شەڕی دوژمنی گەڵ هێندە بێباکین**

ئێستاکە چەقیوین وەکی شێر لە مەیدان

دەس هەڵنەگرین مەرجە لە جەنگین و هەوڵ دان

تا وەرنەگرین مافی خوراوی گەلی بابان

ئێمەینە بەجێماوی قەدەم خێر و کەریم خان

**بۆیە لە شەڕی دوژمنی گەڵ هێندە بێباکین**

سەیری کە، کە **ئاوارە** بە پێشمەرگە دەنازی

چریکەی دێ، بە بێ ترسی دەڵێ هەروەکی بازی

راوەستە هەتا دەتگەمێ ئەی خوێنمژی قازی

هاتووینە نەبەردی هەموو بێگانە بە سازی

**بۆیە لە شەڕی دوژمنی گەڵ هێندە بێباکین**



## لایی‌لایی دایکێکی دڵسۆز بۆ کۆرپە ساواکەی

رۆڵە کۆرپەکەم! ئارامی گیانم!

خونچەی گوڵزاری باخچەی ژیانم!

جگەرگۆشەکەم! بەرهەمی ژینم!

سەروەت و ماڵم! ئاین و دینم!

هێز و تەوژمم! بینای چاوانم!

هاودەنگی بەزمی ڕۆژ و شەوانم!

رۆڵە گیان! مەگری، مەگرە بەهانە

بنوو درەنگە و بەری بەیانە

**هەی لایە لایە کۆرپەی ساوایە**

**کوێر بێ ئەو چاوەی بە تۆ هەڵنایە**

PDF 4 KURD

هەرچەن تۆ دەگری جەرگم کەبابە
من بۆ تۆ چۆنم، تۆش بۆ من وابە
تۆ شاگوڵی جوان، من پاسەوانم
نازت دەکێشم هەتا دەتوانم
دایک ئەو کاتەی دڵی دەسرەوێ
کە کۆرپەی ساوای بێخەم وەرکەوێ
یان بە بزەی لێو بە خەندەی زاری
ئاڵوگۆڕیان کا گریان و زاری

**هەی لایە لایە کۆرپەی ساوایە**
**قەزات لە گیانم تاقانەی دایە**

هەتا ئێستاکە منداڵی وردی
خەڵف و نەمامی بێستانی کوردی
شلکی، ناسکی، نەتداوە بای باڵ
دەرت نەکردووە پەڕ و خەت و خاڵ
بێزمان و بێ بیر، بێ هۆش و تاقەت
خەمبارم دەکەی بە گریە و زاقەت



بەڵام بە هیوای دوارۆژم سا دەی
نەکەی ڕۆڵە گیان ڕەنج بە با دەی

**هەی لایە لایە کۆرپەی ساوایە**
**دە بنوو درەنگە تاقانەی دایە**

هیوام زۆر پێتە وەک باب و کاکت
ببیە سەربازی نەتەوە و خاکت
بەخێوت دەکەم بە گیان و بە دڵ
نەکەی بترسی و لە هیچ بکەی سڵ
زانا و خوێندەوار، چاو و دڵ تێر بی
ڕۆژی تەنگانە پڵینگ و شێر بی
لاوێکی گورج و خاوەن هۆش و بیر
نەترسی لە بەند، لە کۆت و زنجیر

**هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە**
**شەوگار درێژە بۆچ خەوت نایە**

کوڕم تۆ کوردی، تۆ بێچووە شێری
نەتەوەی کاوەی ئازا و دلێری

PDF 4 KURD

باب و باپیرت، خزم و کەس و کار
زۆریان کێشاوە مەینەت و ئازار
بۆ پارێزگاریی نامووس وماڵیان
قەت ڕانەوەستا دەس و گۆپاڵیان
تۆش وەک ئەوان بە، نەترس و نەبەز
بازی کێوی بە، نەک کەوی قەفەز

**هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە**
**هیوای دواڕۆژم لە دەس تۆدایە**



**لە چەپەوە: ١ـ نەناسراو ٢ـ مەلائاوارە ٣ـ مەلای کاژە ٤ـ شەهید قەرەنی ٥ـ شەهید حەسەن ئەلیاس (هاوڕێکانی ئاوارە)**



## پاشکۆ

شاعیری هێژا کاک خالید حیسامی (هێدی) کاتی خۆی لە سەر گیرانی مەلا ئاوارە هەستی خۆی لە هەڵبەستێکدا دەربڕیبوو، دوای بڵاو بوونەوەی ئەم هەڵبەستە، خەڵکی ناوچە بە دەنگ هەڵبەستەکەیان بۆ یەکتر دەخوێندەوە و بەم شێوەیە نەفرەتی خۆیان لە داموودەزگای پەهلەوی دەردەبڕی.

هەڵکشا ئیتر ئەوە زەردەی خۆر
زەردەیان گرت پەمەیی و ئاڵ و مۆر
با لە پێی توند کەمەوە بەنکالان
لێرەوە سەربرە بۆ "دیوالان"[1]
ڕێ دەگەڵ وەش گەلێ کەم مەودایە
هێندە باریکە دەڵێی هەودایە
من بە چالاکی کە وەک تاوێرم[2]
کە دەڕۆم لێرە شەقاو دەژمێرم

---

[1] دیوالان: ناوی گوندێکە لە ناوچەی سەردەشت کە مەلائاوارە لەوێ دەسگیر کرا بە هۆی هێزەکانی میری.
[2] تاوێر: ئەو بەردەیە کە لە سەر شاخەوە بەری ئەدەنەوە داوێنی کێو و جالەی ئەکەن سەرەو ژێر.

لە هەر ئەشکەوت و خڕێ ڕادەبڕم
ڕادەوستم بڕێ هەست ڕادەگرم
دیمەنی جوانە بەڵام وا دیارە
ڕێی مەترسی هەیە بۆ "ئاوارە"
تا بڵێی گوندێ بە داو و کەڵەکە
بەدەهۆن زۆر و بە فێڵ و تەڵەکە
حەوشەیان تۆڕن و ماڵیان بنەیە
هاندەری لێیە خەریکی دنەیە
زڕە کوردی وەکوو کەو[1] دەخوێنن
دەس و دڵ پیسن و دەم بە خوێنن
ناسرەون ساتێ نە ڕۆژێ نە شەوێ
بانگ دەکەن خۆیی ئەویش چەشنی کەوێ
دەیبەن و دەیخەنە داوی دوژمن
دێتە جێ مەرجی شەرەف دۆڕاندن
کوردە بۆ یەک دەبنە نێچیروان

---

[1] خەڵکی گوندی دیوالان بە درۆ نێوانی خۆیان ناخۆش کرد و مەلائاوارەیان بانگ کرد کە گۆیا پێکیان بێنێتەوە، لە بنەوەش حکوومەتیان ئاگادار کرد کە دەوری گوند بدا و دەسگیری بکا، بەمجۆرە گرتیان و دایانە دەس حکوومەت و دەگەڵ دوو هەڤاڵیتری لە سێدارە دران لە شوێنێک بە ناوی ″سەرکەنەکان″ لە ناوچەی سەردەشت.



کورد نەبێ کێی ترە نێچیری وان
پەت و سێدارە ئێتر هەڵدەخرێن
لاوی تێکۆشەری پێدا دەکرێن
جاڕ دەدەن جا هەموو گوند و گەڕەکان
بێن و ڕێیەک بخەنە "سەرکەنەکان"[1]
بێن ببینن کە شەهید "ئاوارە"
سەری چەند بەرزە لە سەر سێدارە
چۆن (حەمەد ئەحمەد و ڕەحمان وەتمان)[2]
بۆ وەتەن مردن و سەریان نەچەمان
هێشتە هەروا لە گەڵی و دارستان
دەگەڕێ دەنگی "بژی کوردستان"
گوند نییە، بنکەیە بۆ ئاژاوە
خۆ فرۆشتن لەوێ ئێستەش ماوە

---

[1] سەرکەنەکان، ئەم شوێنە لە بەر شاری سەردەشت هەڵکەوتووە و کاتی خۆی ڕژیمی پەهلەوی ئێران، شەهید مەلا ئاوارەیان لە گەڵ دوو پێشمەرگەکەی دیکە لەو شوێنە ئێعدام کردن.

[2] (حەمە ئەحمەد و ڕەحمان وەتمان)، ئەو دوو پێشمەرگەیە بوون کە لە گەڵ شەهید مەلا ئاوارە ئێعدام کران هەردووکیان خەڵکی گوندی دیوالان بوون و ناوی ئەسڵیان ″مەلا کەچە″ (محەممەد ئەحمەدی) و (ڕەحمانی حەمەدی وەتمانی چاوشین) بوو.

PDF 4 KURD

نەتـــەویی کـــوردن ئەگـــەرچی کـــوردن
لـــە بەرامبـــەر گـــەلی کـــورد ڕووزەردن
نابـــێ دڵ خـــۆش بـــێ بـــەوە بێگانـــە
کـــوردی کوشـــتن، ئـــەوە کوردســـتانە
تـــا پتـــر خـــوێن بـــڕژێ لـــەم نـــاوە
شۆڕشـــــی گـــــەورەتری بـــــە دواوە









دەی خەیاڵ، باڵێ وەڕازێنەوە دەی
هـەڵفڕە، ڕوو بـە فـڕی مەڵبەنـدم
بمبە جێـڕاوی چـل و چەن ساڵەم
تاکو پێنووسێ وەدەستم دەم زوو
ڕاگـەیێنم بـە کـوڕ و کیـژی قـۆز
ریزەهەڵبەستێ وەسەر ڕێ خەم با
بـا، بـە دڵ دەردی دڵـم درکـێنێ
دڵی "ئـاوارە" لـە مـن ڕازی کـا

سووکەسەر دانێ، بسازێنەوە دەی
جێگەپ و جێفـەڕی لاوی ڕەنـدم
هـەڵوەدە لاپـەڕەیی هـەر ناڵـەم
چەقەساوێکی لە هەستم دەم زوو
مەرحەبایتێکەڵی فرمێسکوسـۆز
لەرز و تاوێکی وەهای وێخەم، بـا
تەکوتوو دۆست و کەسم بدوێنێ
زێڕەوشـانی دەمـی شـانازی کـا